# داستانی یاوەران

بەشی یەکەم

ئامادەکردنی

باوکی عبداللّه

١٤١٨ ١٩٩٧

## پێشکەشە بە :

- گیانی پاکی مامۆستای شەهیدان شەهید عبدالله عزام .

- گیانی پاکی پێشەوای شیشان شەهیدی نەمر جەوهەر دۆدایف

- گیانی پاکی شەهیدی پێشەواو موجاهید سەید ئەحمەد کوڕی عرفانی هیندی .

- گیانی پاکی شەهید حسن البناو شەهید سید قطب .

- گیانی پاکی شەهیدانی کوردستان (مامۆستا شێخ عبداللطیف وماموستا علی بیارەو مامۆستا شەریف و مامۆستا مغدید و مامۆستا وریا کەرکوکی و خدر کۆساری و مامۆستا کەیفی هەولێری و هەموو ئەو شەهیدانەی گیانی پاکی خۆیان کردە قوربانی ڕێگای پاکی ئیسلام ) .

- موجاهیدانی کوردستان و شیشان و سودان و جەزائیرو فەلەستین و میسرو هەموو موجاهیدانی جیهان .

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

الحمد لله والصلاة والسلام على قائد المجاهدين وإمام المتقين سيدنا وحبيبنا محمد ﷺ وعلى آله وصحبه ومن والاه

لەکاتێکدا کۆمەڵگای عەرەبی لە پێش هاتنی ئایینی ئیسلام، چەندین سیفاتی نامۆو ناشیرین و دوور لەهەست و نەستی مرۆڤایەتی بەخۆوە گرتبوو، هیچ ڕووناکی یەك بەدی نەدەکرا، کۆمەڵگەی عەرەبی ڕووی لەهەڵوەشان و لەناوچوون بوو، خودای بەزەیی، ڕەحمەت و بەرەکەتی خۆی نارد بۆ سەر زەوی بۆ چاکترین مرۆڤی سەر زەوی کەوا موحەممەدی پێشەوا بووﷺ ئەویش قورئانی پیرۆز بوو بۆ ڕێنمونی کردنی بەندەکان لەشەوە زەنگی تاریکی‌یەوە بەرەو ڕۆشنایی ئیسلام

بەڵێ موحەممەدی پێشەواو مامۆستا، توانی لەم ماوەیەی ژیانی باشترین و چاکترین قوتابی لە قوتابخانەی ئیسلام کەوا بەڕێوەبەرەکەی گەورەمان موحەممەد بوو ﷺ پێبگەیەنێ و، لەسەر دەستیان ڕۆژهەلآت و ڕۆژئاوا ڕزگار بکاو، تووله ڕێگاکان ڕەش بکەنەوەو خەڵك بەرەو شارێگەی ئیسلام ببەن و، ئیری ستەم و زوڵم لە سەر شانی خەڵکانی ستەم لێکراو لاببەن و ژیانێکی هێمن و ئاسوودە بۆ خەڵکی خودا فەراهەم بهێنن ... لە کاتێکدا ئەم تەرزە بەندانە تەنها مەبەستیان ڕەزا مەندی خوداو بەهەشتی پان و بەرین بوو، ئەوەبوو ماڵ و نەفسی خۆیان فرۆشتە خوا، بۆ ئەوەی لەسەر زەوی تەنها خوا بپەرستری و، هەوری ڕەشی طاغوتان و مل هوڕان لە خوا بی خەبەران لە مرۆڤەکان دوور بخرێنەوە، ئەم بەندە بەڕێزە کۆڵنەدەرانە لە مێژووی پرسەروەری ئیسلام ناسراون بە (صحابە) واتە یاوەری پێغەمبەری خودا ﷺ ....

ئینجا خوێنەری ئازیزو خۆشەویست ئەو کتێبەی لە ژێر دەستت دایە بەناوی (داستانی یاوەران - أسطورة الصحابة) پوختەیەك لە ژیان و بەسەرهات و هەڵوێستەکانی ژمارەیەك لەو یاوەرە بەڕێزانە پێشکەش بە موجاهیدان و موسوڵمانانی کوردستان دەکەین، کەوا ژیانی هەر یەکێکیان بریتی‌یە لە شۆڕش و داستانێکی یەکجار گەورە، کورسی دیکتاتۆرو دونیا پەرستەکانی سەردەم دەهێنێتە لەرزە، داستانی هەر یەکێك لەم یاوەرانە بریتی‌یە لە (ژیان وئاشتی وشەڕو جیهاد و تێکۆشان و یەکسانی و دادوەری و لێ بووردن و برایەتی و ئازایەتی و پیاوەتی و ... هتد )

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ئەم یاوەرە بەرێزانە دەفەرمووێت .[ أصحابي بمنزلة النجوم في السماء ، بأيهم اقتديتم اهتديتم] .. واتە :(یاوەرانم وەك ئەستێرەی ئاسمانن شوێن پێ‌ی هەرکامیان بگرن هیدایەتیان دەست دەکەوێ ) .. ئنجا مسوڵمانان و بڕوادارانی شیرینم ، مادام ئەمە وەسیەتی پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ بێ ، کەواتە بێ سێ‌و دوو وبێ دوو دڵی پێویستە لەسەرمان ئەم مێرخاس و پیاوانە بکەین بە مامۆستا و سەرمەشقی خۆمان ، لەبەر ئەوەی ئەم مەردانە چارەنووسی ئایینەکەیان بە پێش قازانج و سوودی ئەم دونیایە خستووە ، شەهید بوونیان بەپێش ژیانی دونیا خستووە ، لە ژیانیاندا مەرکەزیەتی ئیسلامیان پاراستووەو ، کاری بێ‌سەرو بەریان نەکردووە ، بۆیە پێغەمبەری پێشەواش ﷺ دەربارەیان دەفەرموویت :[في أصحابي كلهم خير] واتە :- یاوەرانم هەمووی لەسەر خێرو چاکەن

بەڵێ کەشکۆڵیان جگە لەخێرو چاکە چیتری تێدا نەبووە ، نەمان بیستووەو گوێمان لێ نەبووە لە یاوەرێك لە یاوەرەکانی پێغەمبەر ﷺ شتێکی خراپ ڕوویدابێ ،بەڵکو بە شەهید بوون و ماڵ ئاوایی هەر یەکێك لەمانە ئەستێرەیەك لە ئەستێرە گەشەکانی ئیسلام کوژاوەتەوە ، ئیسلام پێ‌ی هەتیو بووە ...

چەند تێبینی‌یەکی گرنگیش هەیە بۆ برا مسوڵمانەکانم ، داستانی هەریەکێك لە ژیانی ئەم یاوەرانە ، ووتەو باسەکانی لە گیرفانی خۆمان دەرمان نەهێناوە ، بەڵکو لە سەرچاوەو کتێبە بڕوا پێ کراوەکانی ئیسلامی یەکان وەرمان گرتووە و پێشکەش بە ئێوەی خۆشەویستی دەکەین ، ئینجا تکام وایە ڕەخنەمان لێ نەگرن ، چونکە من خۆم بە نەزان دەزانم ، زانایی تەنها بۆ خوای گەورە باشە ، تەنها ئەو لەهەڵەو یەڵە دوورە .. ئیتر لە خوای گەورە دەپاڕێمەوە کارەکانمان لێ وەربگرێت و دووربین لە ڕیایی و بەدیارکەوتن لەناو خەڵك ...

وآخر دعوانا الحمد لله رب العالمين .....

★ هەولێر★
جمادى الثاني /١٤١٨ك
تشرين الثاني /١٩٩٧ز

﴿١﴾

# موصعەبی کوڕی عومەیر

## یەکەم باڵوێز لە ئیسلام

ئەم پیاوە یەکێکە لە هاوەڵەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ
یەکێکە لە گەنجە هەڵبژاردەکانی قورەیش ، لە شان و شەوکەت و گەنجایەتی
مێژوونووسەکان وا باسی گەنجایەتی دەکەن ، دەڵێن : (جوانترینی گەنجەکانی مەککە بوو )
لە نێو نازو نیعمەت لە دایک بوو و پەروەردە بوو ، گەنجایەتیشی هەر لە نێو سەڵتەنەتدا بوو ، بەڵکو لەناو گەنجانی مەککە نەبوو ، وەکو ( موصعەبی) دایک و باوکی وا بەنازو نیعمەت بەخێوی بکەن ....
بەڵێ ئەم گەنجە تێرو تەسەل و بەنازو نیعمەتە ، قسەی شیرینی سەرزاری ئافرەتان بوو لە جوانی ، وە شەوچراغی کۆڕو کۆبوونەوەیان بوو ، جا گەنجێکی وا ئایا دەبێ ئەم پیاوە بە نازو نیعمەتە بگۆڕێ و واز لەم هەموو خۆشیەی دونیا بهێنێ و ، ڕوو لە ئیمان و بەرخودان بکات ... ؟؟
خوا دەزانێ ئەمە خۆشترین دەنگ وباسە ..... دەنگ وباسی ( موصعەبی کوڕی عومەیر) یان ( موصعەبی خێرو بەرەکەت) هەروەک لە نێو مسولمانان ناوی دەهێنرا بە (مصعب الخير) .....!!
موصعەب یەکێک بوو لەوانەی ئیسلام پێی گەیاند . لە ژێر دەستی پێشەوامان موحەمەد ﷺ پەروەردەبوو ..... ڕۆژێک ئەم گەنجە گوێی لێبوو ، خەڵکی مەکە باسی موحەمەدی ئەمین دەکەن .... ئەو موحەمەدەی کەوا دەڵێت : (خوا ڕەوانەی کردووە بە مزگێنی دەرو ترسێنەر ، وە داواکردنی یەکتاپەرستی خوای تاک وتەنیا ..... کاتێ مەکەیی یەکان شەووڕۆژیان دەکردەوە ، هیچ خەمێکیان نەبوو ، هیچ شتێک خەریکی نەکرد بوون بێجگە لە پێغەمبەرو ﷺ ئاینەکەی ، ئەم گەنجە بەنازو نیعمەتە وەک هەموو خەڵکێک گوێبیست بوو بۆ ئەم دەنگ باسە نوێیە بەلاّم لەگەڵ ئەوەی (موصعەب) تەمەنی بچووک بوو ، کۆڕو کۆبوونەوەی پێ دەڕازاوە لەگەڵ ئەوەشدا هەموو کۆڕەکان پێویستی یان بەوە بوو کە موصعەب لە ناویان بێت بەڵێ بەژن

و بالاً جوانەکەی وقسە ڕێک وپێکەکانی وعەقڵە تیژەکەی ، یەکێک بوون لە سیفاتەکانی (کوڕی عومەیر) بەجۆرە کۆڕو کۆبوونەوەیان پێ خۆش دەکرا.
مو صعەب بە تەواوی بۆی ڕوون بۆوە ، پێغەمبەرو ئەوانەی بڕوایان هێناوە ، لە دوورەوە کۆبوونەوە دەکەن لەبەر ئازاردانیان لەلایەن قوڕەیش ..... ئەمەش لە قەراغی شاری مەککە لە (صفا) لە ماڵی (ئەرقەمی کوڕی ابی ئەرقەم) بوو.
(موصعەب) بەبێ دوو دڵیو دڵە ڕاوکێو ماندوو چاوەڕوان کردن ، ئێوارەیەک ڕووی کردە ماڵی ئەرقەم بە دڵێکی خۆش و پرشنگدارەوە .... لەم شوێنە پێغەمبەر ﷺ قورئانی بۆ هاوەڵەکانی دەخوێندەوە ، نوێژی لەگەڵ دەکردن.
هێشتا زۆری نەمابوو (موصعەب) جێگای خۆی بگرێو بێتە ناو مسوڵمانان و ..... ئایەتەکان لەسەر دڵ ولێوەکانی پێغەمبەر بوون ، دەیویست ڕێگای خۆی بگرێ بۆ گرێچکەو دڵەکان ، تا لەم ئێوارەیەدا دڵی کوڕی عومەیر گەشایەوە بە ئیمان تێراوکرا .... ئەوەندەی نەمابوو لە خۆشیان باڵ بگرێو بفڕێت ، ئەم خۆشیەی کە وای لی کرد ڕێڕەوی ژیانی بگۆڕێت ....
بەلام پێغەمبەر ﷺ دەستی پیرۆزی بەزەیی بۆیان کردەوەو تاکو ئەم بەزەییە گەیشتە سینە گەشاوەکان و ، دڵە بە پەرۆشەکان ، ئارامی دڵی نەوەندەی تۆقیا نووسر قوڵتر بوو .... بەچاوپێکدادانێک ئەم گەنجە بڕوایی هێنو مسوڵمان بوو .... بەگوێرەی ئەم کەتەلۆکەی بۆی دانرا بوو ، بووە بەمسوڵمانێکی نموونە ئاسا بۆ مسوڵمانان .....
دایکی موصعەب ناوی (خوناس کچی مالک) بوو ، خاوەن کەسایەتیەکی بەناوبانگ بوو ، هەتاکو شەرم لی کردنی موصعەب لە دایکی گەیشتبووە سنووری ترس.
(موصعەب) خوا لی ی ڕازی بێ ، ئەو کاتەی بووە مسوڵمان ، هیچ هێزێک نەبوو لە سەر ڕووی زەوی بیترسێنی بێجگە لە دایکی نەبێت ...
خەلکی مەککە بەهەموو گەورە پیاوانی و بیابانیەکان ، نەیان دەتوانی ترسێک دروست بکەن لە دڵی موصعەب ، بەلام دژایەتی دایکی شتێکی تردو نەیدەتوانی لی ی ڕزگار بێت .... لەگەڵ ئەوەشدا موصعەب زۆر بەخێرا بیری کردەوە و ، بڕیاری دا مسوڵمان بوونەکەی بە نهێنی بێ ، تا خوای گەورە دەرگایەکی لی دەکاتەوە ....

بەم جۆرە هاتوچۆی ماڵی ئەرقەمی دەکرد و ، لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دادەنیشت و ، تا دەهات دڵی بە ئیمان پاراو دەبوو ، لەگەڵ ئەوەشدا دەترسا لە تووڕەیی دایکی ، ئەگەر بە مسوڵمان بوونەکەی بزانێ .....

بەڵام مەککە لەم ڕۆژگارەدا ، نهێنی لی بزر نەدەبوو ، گوێچکەو ئاسایشی قورەیش هەموو ڕێگایەکی گرتبوو ، لەپشت هەموو جێ پێیەک وپەناگەیەک خەڵکانێک هەبوون سەرگەرمی سیخوڕی بوون لەسەر مسوڵمانان ، جا لەوانە (عثمان کوری طلحة) بینی وا (مصعب) بە دزی دەچێ بۆ ماڵی ئەرقەم .... پاشان جارێکی تر بینی وا (موصعب) نوێژ دەکات وەکو نوێژی موحەمەد ﷺ ، بێ سێ و دوو پێ برکێی دەکرد لەگەل باو گەردەلوولی بیابان ، تا بگات بە ماڵی دایکی (موصعەب) ئەم دەنگ وباسەی پێ ڕابگەیەنی .....

پاش ئەوەی کە دایکی بەم دەنگ و باسەی زانی ، ئیترکار لەکار ترازاو (موصعب) کاتێک دایکی و هۆزەکەی دەورەیان لیدا بوو ، هەڵساوەو ، ئیسلام بوونی خۆی ئاشکرا کردو ، سوور بوو لەسەر بڕوا هێنانەکەی و ، قورئانی پیرۆزی بۆ خوێندنەوە ئەو قورئانەی پێغەمبەری خوا دڵ و دەروونی پێ ڕۆشن کردبوونەوە ، حیکمەت و دادوەری و لە خواترسان و غیرەتی پێ بەخشیبوون ...

ئەم کارەی (موصعەب) وای لە دایکی کرد بە دەست ئازاری بدات ، بەڵام ئەو دەستەی دەیویست ئازاری موصعەبی پێ بدات ، بەرە بەرە نەرم و شل بۆوە بەرامبەر موصعەب ، لەبەر خۆشویستن و ڕێزی موصعەب ....

بەڵام ئەگەر دایکی لەبەر دایکیەتی ، ئازاری موصعەب نەداو لێی ببورێ ، لە توانای هەیە بەشێوەیەکی تر هەڵس وکەوتی لەگەڵ بکات و ، وای لی بکات واز لەم ئاینە بهێنێ .

بەم جۆرە دایکی لە سوچێک لە سوچەکانی ماڵەوەی بەندی کردو ، فەرمانی گرتنی دا ، بەم جۆرە لە بەندیخانە مایەوە ، تاکو هەندێک لە بڕواداران کۆچیان کرد بۆ حەبەشەو ، ئەویش توانی خۆی لەم بەندیخانەیە ڕزگار بکاو ، خۆی بگەیەنێتە مسوڵمانەکان و ، لەگەڵیان کۆچ بکات بۆ حەبەشە ..

ماوەیەک ماوە لە حەبەشە لەگەڵ برا کۆچکردووەکانی ، پاشان لەگەڵیان گەڕاوە بۆ مەکە ، پاشان دووبارە کۆچی کردەوە بۆ حەبەشە ، لەگەڵ ئەوانەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکرد بوون .... بەڵام ، ئەگەر موصعەب چ لە مەککە بێ یان حەبەشە

تاقیکردنەوەی ئیمانیەکەی بە قۆناغی عەمەلی دا دەڕواو . لە بەردو پێش چوون دەچێت ، لە هەموو کات و شوێنێک پێک هێنانی ژیانی لەسەر تیرازی نوێی ئیمانی دروست بووە ، وە موصعەبیش دڵنیا بوو لەوەی کە ژیانی شایانی ئەوەیە پێشکەش بە خوای گەورە بکات . . .

ڕۆژێک موصعەب بەلای کۆمەڵێک لە مسوڵمانان دا دەڕوا ، کەوا دەورەیان لە پێغەمبەری خوا دابوو ﷺ ، کاتێک کۆمەڵە مسوڵمانەکە موصعەب دەبینن ، سەرێ خۆیان دەهێننە خوارەوە ، چاوی خۆیان دەگرن و فرمێسکیان بۆ دێتە خوارەوە . . . . !!

بەلاّم موصعەبیان بەچ جۆرێک بینی . . . . !! جل وبەرگێکی پینەداری کۆنی لەبەرا بوو ، مسوڵمانان کاتێ سەڵتەنەتی موصعەبیان بە یاد هاتەوە ، کەوا لەم کاتە جل وبەرگی موصعەب وەکو باخچەیەکی بۆندار خۆی نیشان دەدا . . .

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم دیمەنەی لێکداوە بە حەکیمانەو خۆشەویستی یەوە ، کەوا زەردەخەنەیەکی بەزەیی بەسەر لێودکانی هات و ، فەرمووی :

(لقد رایت مصعبا هذا ، وما بمكة فتى انعم عند ابويه منه ، لقد ترك ذلك كله حبا لله ورسوله) . . . !! واتە : بە ڕاستی ئەم موصعەبەم بینی ، هیچ گەنجێک لە مەککە نەبووەکو ئەو خۆش گوزەران بێ لای دایک وباوکی ، بە ڕاستی وازی هێنا لەمانە هەموو بۆ خۆشەویستی خواو پێغەمبەرەکەی)

دایکی کاتێک بە تەواوی لێی نائومێد بوو لە پەشیمان کردنەوەی لەسەر ئیسلامەتی ، ئەم هەموو خۆشی وسەڵتەنەتەی لێ قەدەغەکرد ، ڕازی نەبوو یەکێکماڵی بخوات ، پاشان نەفرین لە بت و خواوەندەکانی بکات ، ئەگەر ئەو کەسە کوڕێ ئەویش بێت . . . . . .

وە ئاخیر پەیمانی موصعەب ، بڕیاریدا هەر کەسێک هەوڵی بەندکردنی بدات ، پاش گەڕانەوەی لە حەبەشە بۆ مەککە ، سوێندی خوارد ئەو کەسە بکوژێت . . . . .

دایکی زۆرباش ڕاستی عەزمی کوڕەکەی خۆی دەناسی ، ئەگەر شتێک بڵێت دەیکات ، بەڵێ لەم سات و کاتەدا کە ماڵ ئاوایی یان لێک دەکرد ، بە گریان یەکتریان بەجێ دەهێشت ، لە کاتێکدا دایکی سوور بوو لەسەر بێ بڕوایی یەکەی و ، کوڕەکەش لەوی زیاتر سوور بوو لەسەر ئیسلامەتی یەکەی ، لە لەم کاتانەدا کە لەماڵەوە ، دایکی موصعەبی دەرکردە دەرەوە ، دایکی پێی گووت : (بڕۆ دەرەوە ، من دایکی تۆ نیم . . . ئەویش لێی نزیک بۆوە و پێی گووت : ئەی دایکە ، من تۆ ئامۆژگاری

دەکەم . بەڕاستی پێت دێتەوە ، شایەدی بدە ، هیچ خوایەک نیە بێجگە لە (اللە) ، و (محمد) یش بەندە و نێردراوی خوایە) ..... (دایکی بە تووڕەیی و گرژییەوە وەڵامی کوڕەکەی دایەوە و گووتی: سوێند بە ئەستێرەکان ، نایەمە ناو ئایینەکەی تۆ گاڵتە بەبیروباوەڕم مەکەو ، بەبێ عەقڵیشم مەزانە)

بەم جۆرە موصعەب لەم نازو نیعمەتە هاتە دەرەوەو کەوتە ناو فەقیری و هەژاری ، وە ئەم گەنجە جل وبەرگ ڕێک وپێکە بۆن خۆشە ، دەتبینی بە جل وبەرگێکی دڕاو ، ڕۆژێک تێرو ڕۆژێک برسی ، بەڵام ڕۆحە پاک وجۆش کراوەکەی بە یەکتاپەرستی و ڕۆناکی خوا ، مرۆڤێکی تری لی دروست ببوو ..

بەڵێ لەم سات و کاتانەدا کەوا مسوڵمانیکی کاملی لی دروست ببوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەڵیدەبژێرێ بۆ کارێکی زۆر گرنگ ، ئەویش ببێت بە باڵوێزی ئیسلام و نێردراوی پێغەمبەر ، سەفارەتێکی ئیسلامی دروست بکات لە شاری مەدینە ، بۆ ئەوەی یاریدەرەکان ئەوانەی پەیمانیان بەستبوو لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ لە عەقەبە ، شارەزایان بکات لە ئایین و بەرنامەی خوا ، بۆ ئەوانەی کە تازە دێنە ناو ئیسلامەوە ، وە مەدینە ئامادە بکات بۆ ڕۆژی کۆچکردنە مەزنەکە .......

لەگەڵ ئەوەشدا لەم کاتەدا صەحابەی تری پێغەمبەر ﷺ ... هەبوون بە تەمەن ترو ناودارتر ، وە خزمی نزیکی خۆشی بوون ، بەڵام پێغەمبەر (موصعەب)ی خێرو بەرەکەتی هەڵبژارد ، کەوا گرنگترین کاروبارو چارەنوسی ئیسلامی لە شاری مەدینەدا دایە دەست ، کە بەم نزیکانە ئەم شارە دەبووە شرێنی کۆچ کردنیان ، دەروازەی بانگەێشتن و سەربازگەی جەنگاوەرەکانیان .

(مصعب) ئەم ئەمانەتە گەورەیەی هەڵگرت بە بیرو هۆشە بلیمەت و ڕەوشتە بەرزەی کە هەیبوو ، توانی دڵ و دەروونی خەڵکی مەدینە پاک بکاتەوە ، ئەوەبوو خەڵکان پۆل پۆل دەهاتن بو ناو ئایینی خوای گەورە ....

پاش ئەوەی کاتی حەج هاتەوە بۆ پەیمانی عەقەبە ، مسوڵمانانی مەدینە نوێنەرانی خۆیان ڕەوانەکرد بۆ دیداری پێغەمبەری خوا ﷺ .... کەوا ژمارەیان حەفتا مسوڵمانی پیاو و ئافرەت بوو ، هاتن لە ژێر سەرکردایەتی مامۆستایان نوێنەری پێغەمبەریان (موصعەبی کوڕی عومەیر) ... بە ڕاستی موصعەبی کوڕی عومەیریش بەم زیرەکی و عاقڵایەتیەی خۆی بۆ خەڵک ڕوون بۆوە کە چۆن پێغەمبەری خوا پیاوی خۆی هەڵدەبژێرێت . ؟!

لە مەدینە پاش ئەوەی لە میوانداری (اسعد کوری زرارە) دابەزی پاشان بنە یەکەوە دەگەڕان بەناو هۆزەکانی و ماڵەکانی مەدینە ، ئەو قورئانەی کە لنە بەریان بوو بۆ خەڵکیان دەخوێندەوەو خەڵکیان بۆ ئیسلام بانگ دەکرد ، تووشی هەندێک ڕەفتاری ترسناک بوون ، ئەگەر لەبەر زیرەکی و دانایی ئەم پیاوە نەبایە ، لەوانەیی تووشی کارەساتی مردن و لەناو چوون دەبوون ......

ڕۆژێک (مصعب) ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد لە مەدینە ، (اسید کوڕی حضیر) گەورەی (بنی عبد الاشهل) بوو لە مەدینە ، حەربەکەی هەڵگیشا بوو ، ئاگرو توورەیی لە نێوچەوانی دەباری ، ڕوو بە ڕووی موصعەب هات ، لەبەر ئەوەی موصعەب میللەتەکەی لە ئایینەکەی هەڵدەگێڕێتەوە ، داوایان لی دەکات خوایەکی تاک بپەرستن کە پێشتر نەیدەناسی و ئولفەتیان پێوە نەگرتبوو .....

خوایەکانی پێشویان جێگاو شوێنیان کە چەسپاوو دیاربوو ، ئەگەر پێویستیان پێیان هەبێ ڕوویان تێ دەکەن و ، نهێنیەکانیان بۆ ئاشکرا دەکات و دوعاکانیان قەبول دەکا ، بەم جۆرە بیریان دەکردەوە و تێی گەیشتبوون بەڵام خوای موحەمەد کە داوای دەکەن لەسەر زاری ئەم نێردراوەی بۆیان هاتوە کەس جێگای پێ نازانی و ، وە کەس ناتوانێ بیبینێ ...........

ئەو مسوڵمانانەی لە دەورەی موصعەب دانیشتبوون ، بینیان وا (اسید کوڕی حضیر) بەرامبەریان دێت و بە توورەیی و خەشم و قینەوە چاوی سوور بووە ، ترسێکیان لی نیشت ، بەڵام (مصعب) بە خۆڕاگری وهێمنی مایەوە و پێشوازی لی کرد....

(اسید) بە توورەیی بەرامبەریان وەستا ، ڕووی کردە ، موصعەب و اسعد کوڕی زرارەو ، گووتی : (چی ئێوەی هێناوە بۆلای ئێمە ، گاڵتە بە بێ هێزەکانمان دەکەن .... ؟ بڕۆن وازمان لی بهێنن ، ئەگەر دەتوانن بۆ خۆتان بژین.

ئارام گرتنی موصعەب ، دەتگووت زەریاییەکەو لە شوێنی خۆی وەستاوە ..... نهێنی ـ یەکانی موصعەب تەقینەوە بەرەو ڕووی ئەم پیاوە ، موصعەب بە قسەیەکی خۆش و نەرم پێی گووت : (دادەنیشی گوێمان لی ڕابگری .... ؟! ئەگەر ڕازی بەوەی پێمانە وەریبگرە ، ئەگەر ڕازیش نەبووی وازت لی دەهێنین و دەڕۆین) .........

لەبەر ئەوەی ئوسەید پیاوێکی زۆر ژیر بوو ، دەبینێ موصعەب سەرپشکی دەکا و داوای لی دەکات بەس گوێی لی ڕابگرێ ..... ئەگەر قەناعەتی هێنا ، ئەوا با

قەناعەت بێنێ ، ئەگەر قەناعەتیشی نەهێنا ، موصعەب هۆزو ناوچەکەیان بەجێ دەهێڵێ و دەگوازێتەوە ....

لێرەدا (اسید) وەڵامی دایەوە و گووتی : ڕاستت گووت ..... حەربەکەی لەسەر زەوی داناو ، دانیشت گوێی لی ڕابگرێ ...!!

ئەوە بوو موصعەب لەم کاتەدا قورئانی بۆ خوێندو ، بانگی ئیسلامی بۆ روون کردەوە ، تا لەم سات و کاتەدا ڕووی (اسید) گەشایەوەو ڕوناک بۆوە قسەکانی گۆڕاو ، حاڵەتێکی تازە بەسەر ڕەفتارەکانی هەموو لەشی گرتەوە موصعەب لە قسەکانی نەبوو بۆوە (اسید کوڕی حضیر) و ئەوەی لەگەڵی بوون خۆیان پێ ڕانەگیراوە یەکسەر بە قسە هاتن و گووتیان : (ئەم قسانە چەند جوان و ڕاستن ...... یەکێک بیەوێ بێتە ناو ئەم ئایینە ، دەبێ چی بکات....!!؟ موصعەب وەڵامی دایەوە و بەڵام چ وەڵام دانەوەیەک دەتگووت عەرد لەگەڵی دەلەرزێ ، پێی گووت : (لەش وجلەکانت خاوێن دەکەیتەوەو خۆت دەشۆیت ، ...... وە دەڵێیت : هیچ خوایەک نیە ، تەنها (اللـه) نەبێت) ....

ساتێکی کەم (اسید) بزر بوو و گەڕاوە ، ئاوی پاک لە پرچی دەتکایەوە ، لە بەرامبەر (موصعەب) وەستاو گووتی: (اشهد الا الـه الا اللّه وان محمد رسول اللّه .........).

دەنگ وباسی مسوڵمان بوونی ئەمان وەکو تیشکی ڕوناکی سەدای دایەوە ، ........ (سعدی کوڕی موعاذ) هاتە لای موصعەب و بڕوایی هێنا و مسوڵمان بوو (سعدی کوڕی عوبادە) شی بە دوا داهات ، مسوڵمان بوونی ئەم تەرزە پیاوانە نیعمەتێکی زۆر گەورە بوو ، لەبەر ئەوە خەڵکی مەدینە بە یەکتریان دەگووت : ئەگەر اسید کوڕی حضیر وسعدی کوڕی معاذ وسعدی کوڕی عبادە ببنە مسوڵمان ئێمە بۆ بەدوا بکەوین ..؟! با بچین بۆلای موصعەب ، بڕوا بهێنین ، ......... دەڵێن گوایە هەق و ڕاستی لە نێوان لێوەکانی ئەو دەردەچێ ....!!!

بە ڕاستی یەکەم نێردراوی پێغەمبەری خوا ﷺ سەرکەوتنێکی هێنا نموونەی نەبوو ، ئەم سەرکەوتنە هەر لە خۆی دەوەشێتەوەو شایانی ئەوە .

چەند ڕۆژو ساڵانێک بەسەرچوو ، پێغەمبەرو هاوەڵەکانی کۆچیان کرد بۆ مەدینە ، قوڕەیشەکانیش لە نێو ڕق و کینی خۆیان دەخولانەوەو ، خۆیان ئامادە دەکرد بۆ شەڕی

ناهەق ، بۆ ئەوەی بەرەنگار بوونە کوێرەکانیان ناڕاستەی بەندە دڵسوزەکانی خوا بکەن

شەڕی بەدر هات و ، قوڕەیشیەکان خۆیان ئامادەکرد بۆئەوەی تۆڵەی خۆیان بکەنەوە ، ئنجا شەڕی ئوحدی بە سەردا هات ، مسوڵمانان خۆیان ئامادە کرد پێغەمبەری خوا ﷺ وەستا لە نێو ریزەکانیان بۆ ئەوەی یەکێک هەڵبژێرێت بۆ هەڵگرتنی ئاڵای جەنگ ، ئەوەبوو موصعەبی خێرو بەرەکەتی هەڵبژارد ئەویش هات بە پیریەوەو ، ئاڵاکەی بە دەستی ڕاست وەرگرت .......
ئەم جەنگە ترسناکە دەستی پێ کرد و گەرم بوو ، بەڵام لە کۆتایی شەڕەکە ، تیرهاوێژەکانی سەر چیایەکە فەرمانی پێغەمبەریان ﷺ شکاند ، شوێنەکانی خۆیان بەجێ هێشت ، کاتێک بینیان گاورەکان ڕو لە شکست و هەڵاتنن ، بەڵام ئەم کردەوەی کردیان مسوڵمانەکان ، بووە هۆی ئەوەی ئەم کارە بە خێرایی پێچەوانە ببێتەوە لە سەرکەوتن بۆ شکان ....... پاش ئەوەی مسوڵمانان ئەم کەلێنەیان بۆ دوژمن بەجێ هێشت ، گاورەکان ئەم دەرفەتەیان بە هەڵ زانی ئەوەبوو شمشێرە تێنوو بە خوێنی مسوڵمانانیان لێ بەکارهێنان.
پاش ئەوەی بینیان پشێویی و شێوان و ترس ڕیزی مسوڵمانانی گرتەوە ، هەموو هێزێکیان بەکارهێنا بۆئەوەی دەست بوەشێنن لە پێغەمبەری خوا ﷺ ..
موصعەبی کوڕی عومەیر هەستی بەم نیازەی گاورەکان کردو ، ئاڵاکەی بەرزکردەوەو ، گرمەی تکبیری (اللە اکبر)ی لێ هەڵساو ، وەکو شێر بۆیان دەرچوو پەلاماری دان ....... بەڵێ هەموو مەبەستێکی موصعەب ئەوەبوو دوژمنان ڕوو لە ئەو بکەن واز لە پێغەمبەری خوا بهێنن ، بەڵی موصعەب شەڕێکی وەهای کرد لەگەڵ دوژمن دەتگووت لەشکرەکە بە تەنها شەڕ لەگەڵ ئەو دەکات .. بە دەستێکی پیرۆزی ، پیرۆزترین ئاڵای هەڵگرتبوو .......بە دەستەکەی تری ، شمشێری دەوەشاند .....
بەم جۆرە دوژمنان دەورەیان دا ، مەبەستیان ئەوە بوو بەسەر لاشەی بپەڕنەوەو بگەن بە پێغەمبەری خوا ﷺ ........
با ئێستاش یەکێک لە بەشدار بوواتی ئەم جەنگە ، باسی شەهید بوونی ئەم کەڵە پیاوەمان بۆ بکات ........
کوڕی اسعد دەڵێت : ابراهیم کوڕی محمد کوڕی شرحبیل ی عەبدەری ، لە باوکی بۆمان دەگێڕێتەوەو دەڵێت : (ڕۆژی ئوحد (موصعەبی کوڕی عومەیر) ئاڵاکەی

هەڵگرتبوو ، دەهاتن و دەچوون (موصعەب) لەشوێنی خۆی چەسپا ، کوڕی (قمینە) سوارچاکێک بوو هاتە بەرامبەری لـە دەستی ڕاستی موصعەبی‌دا ، دەستی بڕاوەو ، ئەم ئایەتەی خوێندەوە : (وما محمد الا رسول قـد خلت من قبلـه الرسل ....)

.... ئالاکەی بەدەستی چەپی گرتەوەو بۆی چەماوە ، لە دەستی چەپیشی درا ، دیسان بۆئالاکە چەماوە بە باسک وسینگی گرتیەوەو ، گووتی : (وما محمد الا رسول قد خلت من قبله الرسل ....) ... پاشان بۆ جاری سێیەم ڕمێکیان لێ‌دا ولەشی کون کردو ، ڕمەکە لە پشتی هاتە دەرەوە ، موصعەب پاش تێکۆشان وجیهادێکی زۆری بە ئیمانەوە کەوتە سەر زەوی ......... وا گومانی دەبرد ئەگەر ئەو شەهید ببێ ، ڕێگا خۆش دەبێ بۆ گەیشتن بە پێغەمبەری خوا ﷺ ئیتر هیچ کەس لە دەوروبەری نامێنێت ..... هەروەها بەم جۆرە دڵی خۆی دەداوە بۆ خۆشویستنی پێغەمبەرەکەی و لەوە دەترسا لە پاش ئەو ئازار بە پێغەمبەر بگات ﷺ ، لەگەڵ لێدانی هەر شمشێرێک لە جەستەی دەیگووت : (وما محمد الا رسول قد خلت من قبله الرسل)........

پاش کۆتایی هاتنی ئەم جەنگە تاڵە ، لاشەی شەهید ڕاکشا بوو لەسەر زەوی‌و ، لەسەر دەم کەوتبوو ، دەم و چاوی سوور ببوو بە خوێنی ئاڵی ولەناو تۆزو خۆڵی جەنگ بزر ببوو ..........

بەڵێ شەهید (مصعب) پێش ئەوەی جەنگ تەواو ببێ ، شەهید بوو نەیدەویست ئەو زیندوو بێت پێغەمبەری خوا ﷺ ئازاری پێ بگات ، بەڵێ لەبەر ئەم هۆیە موصعەب گیانی خۆی بەقوربانی ئایینی خواکردو ، چووە سەنگەرەکانی پێشەوەی جەنگ و شەهید بوو .......

پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ صەحابیەکان دەگەڕا لەناو گۆڕەپانی جەنگ ومـاڵ ئاوایی لە شەهیدە سەربەرزەکان دەکرد ، کاتێک گەیشتە سەر لاشەی موصعەب ، تێرو پڕ فرمێسکی خۆشەویستی و بەزەیی بۆ هەڵڕشت ....

خەبابی کوڕی ئەرت دەڵێ :

(لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچمان کرد بۆ خـوداو لـە پێناوی خـودا ، داوای پاداشتمان کرد لـە خودا ، لـە ئێمە شـەهید بـوون ، هیـچ پاداشـتێکمان لـە دونیـا وەرنەگرت ، لەوانە (موصعەبی کوڕی عومەیر) ـ ڕۆژی ئوحد شەهید کرا ـ هیچ شتێک نەبوو پێی کفن بکەین ، تەنها پێیستێکی پڕینگ نـەبێت کـاتێک لای سـەرمان دادەپۆشی ، پێ‌یەکانی بەدیار دەکەوت ، کـاتێک لای پێمان دادەپۆشـت ، سـەری

بەدیار دەکەوت ... پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێمان کرد لەلای سەری داینێین ، لای پێشی بە جۆرە گیایەک دامان پۆشت .......

لەگەڵ ئەوەی پێغەمبەر زۆر خەمگین و خەفبار بوو بەهۆی شەهید بوونی مامی حەمزە بە تایبەتی دەستکاری کردنی لاشەی پیرۆزی ، هەروەها گۆڕەپانی جەنگ پڕبوو لە لاشەی هاوەڵەکانی ، کەوا هەر یەکێک لەوان ڕۆژێکی پرشنگداربوو لە ڕاستگۆیی و دەست پاکی دا ........

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا لەسەر لا شەی یەکەم باڵوێزو نوێنەری وەستاو ، ماڵ ئاوایی لی کردو ، فرمێسکی وەک لێزمەی بارانی بەهار بۆ دەهاتە خوارەوەو فەرمووی : (من المؤمنين رجال صدقوا ما عاهدوا الله عليه.....) پاشان ئاورێکی لە لاشەی موصعەب داوەو چاوی بە کفنەکەی کەوت ، بە تەماشا کردنێکی پڕ لە خەمەوە ، فەرمووی : (تۆم بینی لە مەککە ، جوانترین وناسکترین جلت لەبەر دابوو ، پاشان ئەوا تۆ دەبینم جلێکی شڕو ، پرچت تۆزاویە) .......

پاشان پێغەمبەر ﷺ لە گۆڕەپانی جەنگ ، بە دەنگێکی بەرز ، فەرمووی : (پێغەمبەری خوا شایەدی دەدا ، لەلای خوا ڕۆژی قیامەت ئێوە شەهیدن) ...

پاشان ڕووی لە هاوەڵەکانی کرد و گووتی :

(ئەی خەڵکینە وەرنە سەر گۆڕەکانیان و زیارەتیان بکەن ، وە سەلامیان لی بکەن بەو خوایەی کە گیانی منی بەدەستە ، هەر کەسێک سەلام لە ئەوانە بکات هەتا ڕۆژی دوایی ، سەلامەکەیان وەلام دەدرێتەوە .....)

السلام عليك يا مصعب .....

السلام عليكم يا معشر الشهداء .....

﴿٢﴾

# رافیعی کوڕی خەدیج

## موجاهیدێکی منداڵ

لە واقیعی ئەمڕۆماندا ئەم ڕاستی‌یە بە چاو بینراوە ، ئەو جەنگاوەری دەچێ بۆ گۆڕەپانی جەنگ ، ئەگەر بڕوای بەم جەنگە نەبێ ڕۆحی بەرخودان و ، یاخود مانەوەی لە بەرەکانی جەنگ دا نابێ ، بۆیە هەر کاتێک هەلێکی بۆ ڕەخسا ئەوا پشت لە دوژمن دەکاو خۆی دەدا بە دەستەوە یان هەڵدێت ، لەبەر ئەوەی بەشداری کردنی لەم جەنگە بە ئارەزووی خۆی نەبووە ، بە زۆری بووە ، یان بە ناچاری یان لە شەرمان بووە لەبەر ئەوە ئەوکەسە وا هەست دەکات کەوا کارێکی قورس لەسەر شانی دانراوە ، کاتێک کە دەکەوێتە ناو شەڕیش جۆرەها خەیاڵی بۆ دێت ، ئنجا جاری وا هەیە گوللەیەک لە شوێنێکی خۆی دەدا بۆ ئەوەی شکستێک لە لەشی دروست بکات ...... یان خۆی دەدزێتەوە لەو ئەرکانەی لەسەری دادەنرێت ..... یان جەنگەکە بەجێ دەهێڵێ و هەڵدێت .... دوای گەڕانەوەی بۆ ماڵەوە ، بەهۆی دەزگای پۆلیسەوە دەسگیر دەکرێتەوەو ڕەوانەی سەربازگە واتە شوێنی خۆی دەکرێتەوە ....

بەڵام با ئەمجارە بزانین ڕوحی خۆ بەکوشت دان چۆنە لە ئیسلامدا ..!!!؟ با لە کاتی پێغەمبەر پێشەوای موجاهیدان ﷺ دەست پێ بکەین ، بەڵێ .... کاتێک لەسەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ (نفیر عام) لێ دەدرا ، واتە بانگهێشتنی گشتی بۆ جەنگ ، هیچ ماندووبوون وگرتن و ئازار بەکارنەدەهێنرا بۆ کۆکردنەوەی موجاهیدان ، بەڵکو زۆر جاریش هەبوو بە ناو ڕیزەکانی موجاهیدان دەسوڕانەوە ، کۆمەڵێکیان لێ دەردەهێنا و نەیان دەهێشت بەشداری جەنگ بکەن ، لەگەڵ ئەمەشدا ئەم تەرزە کەسانە کاتێک ڕێگایان پێ نەدەدرا ، بەدڵێکی پڕ خەم و خەفەتبار دەگەڕانەوە ، پێغەمبەرمان موحەمەد خودی خۆی بەناو لەشکردا دەگەڕاو دەیپشکنیەوە ، ئەوانەی منداڵ بوون (سن بلوغ) یان تەواو نەکرد بوو ، یان نەخۆش بوون ، یاخود بۆ کارێکی گرنگتر ، کە ئیسلام پێویستی پێ‌ی هەبوون ، دەگێردرانەوە ........

وە عەبدوڵای کوڕی رافیعی کوڕی خەدیجی کوڕی ڕافیعی ئەنصاری نموونەی ئەم باسەمانە ، عبدالله تەمەنی منداڵ بوو . شاتە ناو ئیسلام . هەر لەو کاتەی جەنگی

بەدر هاتە پێشەوە ، ئەم منداڵە ئامادە بوو بۆ ئەوەی بەشدای جەنگ بکات و شەهید ببێ . . . . . .

بەڵام پێغەمبەری خوا پاش ئەوەی گەڕا بەناو ڕیزی موجاهیدەکان و ، ڕافیعی گەڕاندەوە بۆ مەدینە ، چونکە تەمەنی منداڵ بوو ، لەگەڵ ئەوەش دا ڕافیع زۆری پێ ناخۆش بوو ، بە بەشداری نەکردنی لەم جەنگە پیرۆزە ، بەم جۆرە پێغەمبەری خوا ﷺ هەر موجاهیدێکی تەمەنی لە پانزە ساڵ کەمتر بوایە ڕێگای نەدەدا بە بەشداری کردنی لە جەنگ .

پاش ساڵێک تێپەر بوون بەسەر غەزای بەدردا ، غەزای (ئوحد) هاتە پێشەوا بەڵام ڕافیع لەم ماوەی یەک ساڵەدا ، خۆی ڕاهێنا لەسەر تیر هاوێشتن ، دیسان لە ڕیزی پێشەوەی لەشکر ئامادە بوو . دووبارە پێغەمبەر ﷺ دەستی کرد بە پشکنینی لەشکر ، دووبارە ڕافیعی گێڕاوە ، لەبەرئەوەی هێشتا تەمەنی لەپانزە ساڵ کەمتر بوو ، هەروەها چەند موجاهیدێکی تریشی گێڕایەوە نەیهێشت بەشداری جەنگ بکەن لەوانە : (ئوسامەی کوڕی زەید ، بەراء کوڕی عازب ، ئەسید کوڕی فهێر ، عومەری کوڕی حەزم ، ابو سعیدی خودری ، زەیدی کوڕی حارثە ، سەعدی کوڕی حەیثەمە زەیدی کوڕی ئەرقەم ، سەعدی کوڕی حەبتە) .

ڕافیع چاوی لەوە بوو ئەمجارەیان پێغەمبەر ﷺ نەیگێڕێتەوە بۆیە هەندێک لە صەحابیەکان گووتیانە پێغەمبەر ﷺ : (ڕافیع تیر هاوێژێکی زۆر چاکە ، هەروەها باڵا بەرزو بەقەڵافەتە . . ) پێغەمبەر ﷺ ڕێگای دا بە بەشداری کردنی لە جیهاد ، ڕافیع لە کەیف خۆشیان ئەوەندەی نەما بوو بفرێت ، لەبەر ئەوەی یەکێک لە ئاواتە هەرە بەرزەکانی هاتە دی ، لەوانەیە یەکێکوا گومان ببات ، لەبەر زۆری ژمارەی لە شکرەکە بوو ، پێغەمبەر ﷺ ئەم کۆمەڵەی گەڕاندەوە ، بەڵام ئەمە لە ڕاستی دوورە ، لەبەر ئەوەی ژمارەی ئەو مسوڵمانانەی بەشداری شەڕی ئوحدیان کرد تەنها حەفت سەد موجاهید بوون ، بەڵام ژمارەی گاورەکان ژمارەیان سێ هەزار کەس بوو ، واتە چوار بە قەدەر ژمارەی ئەوان . . . . . . . بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم خونچە گوڵانەی هەڵگرت بۆ ڕۆژانی داهاتووی زێڕینی ئیسلام کە ئیشی پێ هەبوون بەکاری هێنان بۆ چەند کاروبارێکی گرنگتر .

لەگەڵ ئەمەشدا هەندێ کەسی لە ئیسلام تەگەیشتوو ، وا خەیاڵ دەبەن ئەم کردەوەی رافیع پێی هەڵسا ، بریتی بوو لە خوێن گەرمی و خۆ بە هیلاک دان . . . . .
بەڵام رۆژگار سەلماندی کەوا چۆن قورئان بڕوادار فێری بڕوا بوون بە خواو ئازایەتی و پشت بەستن بە خوا دەکا ، کاتێک دەفەرموێت : (قل لن یصیبنا الا ما کتب الله لنا هو مولانا وعلی الله فلیتوکل المؤمنون) . . . .
ئەوە بوو رافیع بەشداری جەنگی ئوحدی کردو دەورێکی ئازایانەو مەردانەی گێڕا لەم جەنگەدا تەنها تیرێکی بەرکەوت و تووشی بریندار بوو ، رافیع خوا لیی رازی بێت تیرەکەی لە سینگی دەرهێنا ، بەڵام پاشماوەی ژەهرەکە لە ناو لەشی ماوە لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ بە رافیعی فەرموو : (ئایا حەز دەکەیت پاشماوەی ژەهرەکە لە ناو لەشت بمێنێتەوە ، بۆ ئەوەی لە رۆژی دوایی شایەدیت بۆ بدەم تۆ شەهیدی . . . . . )
رافیع رازی بوو بەم بازرگانیەی پێغەمبەر ﷺ دەستی هێنا بەشوێنی برینەکەو بە ناوی دەمی پیرۆزی برینەکەی پێ تیمارکرد و ئنجا بەرەو چاک بوونەوە چوو .
رۆژان و ساڵان بەسەر چوو رافیع زیاتر سەرگەرمی و عەشقی جیهاد گری لە دڵ و دەروونی بەرداو هەتاکو لەناو عەشیرەتەکەشی بوو بە پیاوێکی دیار و لە کاروبارەکانیان پرس و رایان پێ دەکرد . . . . . .
رافیع (خوا لیی رازی بیت) زۆر ئیمام عەلی خۆش دەویست و بە حەقی دەزانی بۆیە پاڵپشتی کرد و بەشداری شەڕەکانی کرد دژی یاخی بووەکان ، رافیع لەگەڵ ئەم ژیانە جیهادیەی ، لایەنی پەروەردە وزانستی پشت گوێ نەخست ، بە دەیان فەرموودەی لەسەر زاری پێغەمبەری خوا گێڕاوەتەوە ، کە بەشێکیان لەلای هەردوو فەرموودناسی بەرێز (بوخاری و موسلیم) ە . . . . .
لەگەڵ ئەم هەموو زەحمەتکێشانەی رافیع کاروباری دین و دونیای پێکەوە بەستبۆوە ئەوە بوو خەریکی کشتوکاڵ بوو ، خۆی زەوی دەکێڵا . . . . . . .
خوای گەورە تەمەنێکی درێژو پڕ خێرو بەرەکەتیدا بە رافیع لە تەمەنی هەشتاو شەش ساڵیدا ، رۆحی پاکی بەخوای گەورە سپارد ، هەر دەتگووت پێغەمبەری خوا ئەم فەرموودەی لەسەر ئەو فەرمووە ، کە دەفەرمووێ :

(خيركم من طال عمره ، وحسن عمله) ....... واته : (چاکترینتان ئەو کەسەیە تەمەنی درێژ بێ و ، کردەوەی چاکی زۆر بێت .... لەبەر ئەوەی خوای گەورە پێغەمبەرەکەی خۆی خۆش ویستووە هەر دەبایە ئەو بەڵێنەی کە دابوو بە ڕافیع بێتە جێ و ، پاش ئەم تەمەنە پڕ خێرو بەرەکەتە ، خوای گەورە ویستی وەها بوو ، پاشماوەی ئەم سەرە تیرە ژەهراویە سەر هەڵبداتەوەو برینەکەی لێ نوێ ببێتەوە ، لە سەردەمی عەبدولاّی کوڕی مەروان ساڵی حەفتا و چواری (٧٤) کۆچی لە شاری مەدینە ، بەخاک سپێردارا ..... بەم جۆرە خوای گەورە پلەی شەهیدی پێ بەخشی وگیانی پاکی لە شەقەی باڵی داو ، گەیشتە کاروانی شەهیدان ، عەبدولاّی کوڕی ئیمامی عومەر (خوا لێی ڕازی بێت) نوێژی لەسەر لاشە پیرۆزەکەی کرد .........

٣

# حمزەی كوڕی عبدالمطلب

## شێری خواو سەروەری شەهیدان

{٣}

# حەمزەی كوڕی عبدالمطلب

## شێری خواو سەروەری شەهیدان

كاتی شەوە ، دونیا كش و ماتە ، ئەستێرەكان بە ئاسمانەوە دەدرەوشێنەوە ، قورەیشیەكان پێیان ڕاكێشاوە لەسەر جێگاكانیان و خەڵكی مەككە لە پرخەی خەون ، تەنها وتەنها یەك كەس نەبێت ئەویش پێغەمبەری خوایە ﷺ جێگای نووستنی خۆی بەجێ هێشتووەو ، لەبەر ئەوەی مەوعیدی لەگەڵ خوای خۆی هەیە ، بەرەو میحراب دەڕوات ... ستایشی خوا دەكاو دەست پان دەكاتەوە بەرامبەر خوداو دۆعا دەكات ... ناوە ناوە ، خەدیجە لەخەو هەڵدەستاو لەبەر دەنگە دەنگی و خرپە خرپی دوعاو نزاو گریان وپارانەوەی پێغەمبەر ﷺ ... بەزەیی بە پێغەمبەر دەهاتەوە ، لەبەر ئەوەی لە ڕادە بەدەر خەوی لە خۆی حەرام كردبوو ، خەدیجە داوای لێ دەكرد تۆزێك چاوی بكەوێتە خەو ... بەڵام فرمێسكی چاوی پێغەمبەر ﷺ وەڵامی خەدیجەی دەداوەو دەیگوت : (لقد انقضى عهد النوم يا خديجة) - كاتی خەو ڕابوورد ئەی خەدیجە .

هەتا ئەو كاتە بانگەكەی پێغەمبەر ﷺ بە شێوەیەكی نهێنی بوو ، خەڵكەكەش لە پێغەمبەر ﷺ وورد دەبوونەوە سەریان لە هەڵس وكەوتی سووڕمابوو ، كاتی پێغەمبەرایەتی تازە دەستی پێكردبوو ، بانگی ئیسلامەتی دەكرد بە شێوەیەكی نهێنی.

ئەوانەی كە بڕوایان هێنا بوو لەو كاتەدا زۆر كەم بوون .... لێرەدا هەندێك لەوانەی بڕوایان نەهێنا بوو ، پێغەمبەریشیان زۆر خۆش دەویست ، پێغەمبەر ﷺ دەستی بۆ درێژ دەكردن بۆ ئەوەی بڕوا بهێنن و بێنە ناو ئەو كاروانە پیرۆزە ، هیچ شتێك ڕێگای پێ نەدەگرتن بۆ ئەوەی بێنە ناو ئیسلام ، تەنها ئەو عورف و عادەتە دەسكردانە نەبێت كە لە باوك و باپیریانەوە بۆیان مابۆوە ، بەڵام ئەم گومڕاهیەیان لە ناوابوون دابوو و ، نزیك بوو خۆری ئیسلام هەڵبێت ....

یەكێك لەوانەی كەوا پێغەمبەری ﷺ زۆر خۆش دەویست و بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا هەر لە تاریكی وگومڕاهی‌دا بوو ، ئەمەش (حەمزەی كوڕی عبدالمطلب) بوو ، مامی پێغەمبەر و برای شیری پێغەمبەر ﷺ

پێغەمبەری تەنها بەوە نەدەناسی کەوا مامی ئەوەو برازایەتی ، بەڵکو بەوە دەیناسی کەوا برابەتی و هاوڕێیەکی نزیکیەتی .... چونکە پێغەمبەرو حەمزە منداڵی یەک کات و یەک تەمەنن و ، بە یەکەوە گەورە بووتە ، پێکەوە یاری‌یان کرد ووەو ، برای یەک برونەو . لە هەموو هەنگاوەکانی ژیان لەگەڵ یەکتر یادگاریان هەیە ......

بەلاّم گەنجایەتی ئەم دوو زاتە پیرۆزە هەر یەکێکیان ڕێگایەکی گرتۆتە بەرو مەبەستێکی تایبەتی‌یان هەیە ... (حەمزە) پێشبرکێی بوو بۆ گەیشتن بە ئارەزووەکانی دونیاو ، هەروەها جێگای خۆی بکاتەوە لە نێو گەورەکانی قورەیشدا .... بەلاّم (محمد)ی پێشەوامان دەروون و دڵی خۆی پاک کرد بۆوە بە ڕێگای بەرزی ئیسلام و ، تەنها قسەی لەگەڵ دڵە پاکەی خۆی دەکرد و خۆی دوور دەخستەوە لە ئارەزووەکانی دونیا و ، خۆی ئامادە دەکرد ، بۆ ئەوەی باوشی خۆی بکات بە هەق و ، بە دڵ و بە گیان وەری بگرێت .

ئێمەش دەڵێین : هەر چەندە ژیانی گەنجایەتی هەر یەکێکیان لایەنێکی پێچەوانەی گرتبوو بەلاّم (حەمزە) لەگەڵ ئەمەشدا هیچ کاتێک ئەو یادگارانەی لە بیر نەچوبوو کەوا لە گەڵ برازاکەی بەسەری بردبوو ، ئەویش ئەو سیفاتە بەرزانە بوو کەوا جێگای خۆی کرد بۆوە لە ناو دڵەکانی خەڵک و ، وێنەیەکی ئاشکرای خۆی کێشا بوو بۆ ئەوەی بگاتە داهاتوویەکی بەرز .

لەبەرە بەیانی هەمان ڕۆژ (حەمزە) وەکو پیشەی جارانی دەچووە دەرەوە ...... لە بن دیواری کەعبە چەند کەسێکی بینی لە گەورەکانی قورەیش لەگەڵیان دانیشت ، گوێی ڕاگرتبوو بزانی چی دەڵێن ئەوانیش باسی (محمد) یان دەکرد ...

ئەوە بوو بۆ یەکەم جار (حەمزە) ئەوانی بینی تەمێکی ڕەشیان بە سەر داهاتووە لە خەفەتی برازاکەی حیقد و دوژمنایەتی و تووڕەیی‌یەکی زۆر دیار بوو لە قسەکانیان پێشتر زۆر گرنکیان بە کارەکەی پێغەمبەر ﷺ نەدەدا .... بەلاّم ئیمڕۆ دەبینی دەم و چاویان تووڕەیەو ، نیازی خراپیشیان هەیە ....

(حەمزە) زۆر بەقسەکانیان پێ‌کەنی و ، بۆی دەرکەوت لە قسەکانیان تێیان بەڕاندووەو کارەکە بە تەواوی هەڵناسەنگێنن .....

(ابو جهل) کۆمەڵەکەی دڵنیا کردەوە بەوەی کەوا (حەمزە) بەم کارەی (محمد) دەزانێ‌و ، بەلاّم دەیەوێت کارەکە ئاسایی بێتەوەو . خەڵکی مەککە خەویان لێ

بکەوێت و ، هەتا ڕۆژێک لە خەو هەڵدەستن ، دەبینن کار لە کار ترازاوەو ، نیشەکە بەسەرماندا شکاوە .

بەم جۆرە قسەکانیان بریتی بوو لە تهدید وخۆ گیف کردنەوە ... جارێک (حەمزە) دەگرژیەوەو ..... جارێکی تر تووڕەیان دەکردەوە ، پاش ئەوەی دانیشتنەکەی بن دیواری کەعبە تەواو بوو ، هەر یەکە لە شێوێنی خۆی هەڵساو ڕێگای ماڵەوەیان گرتە بەر ، بەڵام (حەمزە) پاش ئەمە سەر گران بوو بە بیروباوەڕێکی نوێ ، کەوا پەیوەندی هەبوو بە داهاتووی برازاکەی ، سەر لە نوێ قسەی لەگەڵ خۆی دەکرد وبیری دەکردەوە . .

چەند ڕۆژێک بەسەرچوو ، ئەو بانگی ئەوی دەکرد و هەموو ڕۆژێک پسە پسی قوڕەیشەکان لە پەرەسەندن دابوو دەربارەی ئەو بانگە نوێیەی (محمد) ﷺ پاشان ئەم پسەپسەی سەرانی کوفر گۆڕا بۆ شێوازی (ڕێ لێ گرتن) واتە نەهێشتنی بڵاوبوونەوەی بانگەکەی ، (حەمزە)ش لەدوورەوە موراقەبەی ئەم هەڵوێستانەی دەکرد .

بەم جۆرە (حەمزە) سەری سووڕمابوو لە خۆڕاگری برازاکەی ، هەروەها بێجگە لە خۆڕاگرتنی پێغەمبەر ﷺ لەسەرخستنی داواکەی ، ئەم وازنەهێنان وسوور بوون لەسەر داواکاریانەی شتێکی نوێ بوو سەبارەت بە قوڕەیشەکان ......

وە ئەگەر شەک وگومان بیترانیانیە لەم ڕۆژەدا فێڵ لە نەفسی یەکێک بکات دەربارەی ڕاستی پێغەمبەر و بەرزی سفاتەکانی ئەو شەک وگومانە نەیدەتوانی یەک دەرگا ، بەڵکو دەلاقەیەکیش لە هەستی (حەمزە) بکاتەوە بەرامبەر پێغەمبەر ﷺ.

کەس بە قەدەر (حەمزە) پێغەمبەری نەدەناسی ، هەر لە کاتی منداڵیەوە ، تاکو گەنجایەتی ، تاکو پیاوەتی دەسپاکی بێ وێنە . پێغەمبەری دەناسی هەروەک خۆی ، خۆی دەناسی ، بەڵکو زیاتریش لە خۆی برازاکەی دەناسی هەر لە منداڵیەوە تاکو گەورە بوون ، ڕابردووی پێغەمبەر ئەوەندە پاک بوو دەتگووت ، تیشکی خۆرە (حەمزە) بە درێژایی ژیانی یەک شوبهەی لە پێغەمبەر نەدەکرد و جارێک لە جاران بە یادی دا نەدەهات پێغەمبەر ڕەزیل بوو بێت یان دوو ڕوو بووبێت ، یان بە تماع بوو بێت ، یان ئارەزوو باز بوو بێت ، یان لە کاتی گرفتدا ووره ڕوخاو بێت ..... (حەمزە) تەنها بە هێزی بازوو بەناوبانگ نەبوو . بەڵکو تا بڵێی هۆشمەند و بلیمەت و دەروون بەهێز بوو ...

بەم بیرکردنەوەو وورد بوونەوە لە ڕەفتارو هەڵس وکەوتی برازاکەی دڵی نەرم بوو ، ئامادە بوو بۆ ڕۆژێک تیشکی ئیمانی کەوێت و ، ئەوەبوو بۆ ماوەیەکی کەم

هەلوێستی خۆی بە دیار خست .... (حەمزە) لە ماڵ دەرچوو ، تیروکەوانەکەی بە دەستەوە بوو ، ڕووی کردە بیابان بۆ هێنانەدی هیوایەتە خۆشەویستەکەی ، وەرزشە دەروونی یەکەی. کە ڕاوکردن بوو ، شارەزایی یەکی ڕادە بەدەری هەبوو لیی. چەند ڕۆژێکی لە بیاباندا بە ڕاوکردن بردەسەر ، پاش ئەوەی گەڕاوە لە ڕاوکردن هەروەک نەریتی بەردەوامی پێش ئەوەی بچێتە ماڵەوە ، تەوافی کەعبەی دەکرد .
لە نزیک کەعبەوە ، تووشی بە تووشی خادیمی عبداللە ی کوڕی جودعان بوو ...
حەمزە ئەوی نەبینیبوو تاکو لە پڕێکدا پیی گووت :
(یا ابا عمارة ... لو رایت ما لقي ابن اخیك محمد انفا ، من ابي الحکم بن هشام ، وجده هناك جالسا ، فاذاه وسبه ، وبلغ منه ما یکره).
(ئەی باوکی عومارە. ئەگەر دەمێک پێش ئێستا بتبینایە چی یان بە برازاکەت کرد ، لەلایەن (ابی الحکم کوری هیشام) ، لێرە دانیشتبوو ، ئەشکەنجەی دا ، جوێنی پیدا ، ئەوەی پیی ناخۆش بوو ئەوەی گووت) .
پاشان لەگەڵی دانیشت بەسەرهاتەکەی هەموو بۆ گێڕایەوە ....
حەمزە گوێی لە قسەکان بە تەواوی گرت و پاشان ساتێک داما و یەکسەر دەستە بەهێزەکەی درێژ کرد بۆ تیروکەوانەکەی و لەسەر شانی خۆی قایم کرد ، پاشان بۆی دەرچوو بەدەوری کەعبەدا سوڕا تەمەنای ئەوەی دەکرد ، بگات بە (ابوجهل) ، ئەگەر لەم شوێنەش تووشی بە تووشی نەبایە ، لە دووای بگەڕێ هەتا دەیدۆزێتەوە ....
ساتێکی کەمی نەبرد هێشتا کەعبەی بەجێ نەهێشتبوو ، بینی (ابوجهل) لە ناو حەوشی کەعبە لەگەڵ چەند گەورەیەکی قورەیش ڕاوەستاوە .....
لەکەشێکی نارامی ترسناک دا ، حەمزە پێشی گرت لە (ابوجهل) پاشان کەوانەکەی بڵند کرد و دای لە تەوقی سەری (ابوجهل) سەری شکاند و خوێن بەسەری دا هاتە خوارەوە ......
پێش ئەوەی قسەیان لە دەمی دەربێ و نقەی بکەن ئەوانەی لەوێ دانیشتبوون سەریان سوڕما لەم ڕەفتارەی (حەمزە) ، (حەمزە) هاواری کردە سەر (ابوجهل) و پیی گووت :
(اتشتم محمدا ، انا علی دینه اقول ما یقول ...؟؟الا فرد ذلك علی ان استطعت)...
ئایا جوێن بە (محمد) دەدەن ، من لەسەر ئایینی ئەوم و ئەو چی بڵی ئەوەی دەڵێم ..؟؟ ئەگەر خۆت بە پیاو دەزانی چیت پێ دەکرێ ئەوەی بکە .

ساتێکی نەبرد ، دانیشتووەکە هەر هەموو ئەو ئیهاناتانەیان لە بیرچوو کە بە گەورەیان (ابو جهل) کرا !!! کەوا خوێن لەسەری دەهات ، خەریکی کردن بەو ووشەیەی وەک تریشقە بە رووی‌دا دان ، ئەو ووشەیەی حەمزە بەسەر دەمی هات ئەوەیە لەسەر ئایینی (محمد) ەو ، ئەو قسە دەڵێت کە محمد دەیڵێت ....

ئایا حەمزە بووە مسوڵمان ........ ؟؟

چاکترین گەنجی قورەیشی‌یەکان و لە هەموویان بەهێزترو شکۆمەندتر ........ ؟!!

قورەیشی تووشی بەلای خۆیان بوون ناتوانن ئەم شتە لەسەر خۆیان لادەن ، مسوڵمان بوونی حەمزە ڕێگای بۆ زۆربەی خەڵک کردەوە بۆ ئەوەی بێنە ناو ئیسلام ، بەم جۆرە (محمد) ﷺ بەهێز دەبێ و بانگەکەشی سەردەکەوێ و پشتی خۆی قایم دەکات ڕۆژێک دێت لە قورەیشەکان هەڵدەستێتەوەو بتەکان و خوایە دەستکردەکانیان هەموو دەشکێنێ .....!!!

بەڵێ ... حەمزە مسوڵمان بوونی خۆی لەناو خەڵک ئاشکرا کرد و ، سواری ئەسپەکەی خۆی بوو و کۆمەڵەکەی بە دڵ شکاوی و نائومێدی بەجێ هێشت ... (ابو جهل) یش خوێنی سەری دەسڕیەوە بە هۆی شکانی سەریەوە ، قۆشمەکی بە ئەسپەکەیەوە لە دەوردی خەڵکەکە دا و کەوانەکەی لەسەر شانی توندکرد و هەنگاو بە هەنگاو ڕێگای ماڵەوەی گرت .....

حەمزە خاوەن عەقڵێکی تەواو بوو زۆر بلیمەت بوو ، ئەو کاتەی گەڕاوە ماڵەوە ، پاش ئەوەی کەمێک حەساوەو تۆزی ڕێگای لەسەر لاکەت ، دانیشت و بیری کردەوە لەم شتانەی بەسەری هات ....

چۆن مسولمان بوونی خۆی ئاشکرا کرد .... ئایا کاتی خۆی بوو ... ؟؟!!

مسوڵمان بوونی خۆی لە کاتێکی غیرەت و تووڕەیی و هەڵچوون ئاشکرا کرد ....

خراپی بەو کەسانە کرد کە خراپەیان بە برازاکەی کرد بوو ، زوڵمیان لی‌کرد بەبێ ئەوەی بزانن ئایا ئەو کابرایە کەس پشتگیری لی‌دەکا ، یان نا ...!!! بەم جۆرە لی‌یان تووڕە بوو غیرەت گرتی لە پێناوی شەرەفی ئەوەی هاشم ، ئەوە بوو مسوڵمان بوونی خۆی ئاشکرا کرد و بەبێ ئەوەی بترسێت و سەری (ابو جهل) یشی شکاند ...!!!

بەلام ، ئایا ئەم ڕێگایە ڕێگایەکی نموونەیی بوو بۆ ئەوەی یەکێک وازبهێنی لە ئایینی باوک و ئەتەوەکەی ، ئایینی زەمانەو سەردەم پاشان یەکسەر پێشوازی بکات

له ئایینێکی نویٚ ، کەوا هیچ تەجروبەیەکی لەسەر نیەو شارەزایی یەکی وای نیە تەنها شتێکی کەم نەبێت .

ڕاستە (حەمزە) هیچ گومانێکی نەبوو لە پاک و ڕاستگۆیی (محمد) ونیازەکانی . بەلاٚم ئایا دەبێت مرۆڤ بەخێر هاتنی ئایینێکی نوێ بکات ، لە کاتی توورەیی ، هەروەک (حەمزە) کردی . . . ؟؟!!

بە ڕاستی باوەشی خۆی کردەوە بۆ ڕێز لیٚنانی ئەو بانگە نوێیەی کەوا برازاکەی ئالاٚکەی هەلگرتبوو . . بەلاٚم ، ئەگەر توانی ببێتە یەکێک لە شوێن کەوتووانی ئەم بانگە ، بڕوای پیٚ بهێنێ ، وە بەرگری لیٚ بکات ئایا ئەم کاتە کاتێکی شیاوە بۆ ئەوەی بێتە ناو ئەم ئایینە . . . . . ؟!!

کاتی توورەیی و غیرەت . . . . ؟ یان کاتەکانی بیرکردنەوەو هێمنی . . . ؟؟

بەم جۆرە بیرو هۆشی لەسەری فەرز کرد بۆ ئەوەی ڕێگا ڕاستەکە هەلبژێری ، بەم شێوەیە کێشەکانی خۆی دا بەر بیر کردنەوە پاک وتیژەکانی . . .

ئەم لێکدانەوەی حەمزە چەند ڕۆژێکی برد ، ئیسراحەتی لیٚبڕا ، بە شەو چاوەکانی نەدەچووە خەو . . . بۆ ئەوەی بگات بە ڕاستی یەکان ، گومانەکانی دلی خۆی بەکار هێنا . . . . . بەم جۆرە ، (حەمزە) بۆ ماوەیەکی کەم عەقلی بەکارهێنا بۆ دۆزینەوەی ڕێگای ڕاستی ئیسلام ، بۆ ئەوەی هەلیسەنگێنیٚ لەنێوان ئاینی باپیرانی و ئایینی نویٚ ، تا وای لیٚ بیٚ ، گومان لە ناو دلی دروست بیٚ بەهۆی ئەو دینە فیطریەی کە لە باوک وباپیرانی بۆی مابۆوە ، کەوا کاتی خۆی بە بەنرخترین سامانی دەزانی . . . . (حەمزە) هەموو یادگارەکانی دەهاتەوە پێش چاو لەناو کەعبەدا . . . . . خوایەکان و بتەکان و . . . . . بە گەورە زانینی ئەو ئایینەی کەوا بتە دەستکردەکانی بەخشی بووی بە قورەیش بە تایبەتی خەلکی مەککە .

(حەمزە) سەری سوڕما بوو لەوەی کەوا چۆن مرۆڤ بۆی دەگونجیٚ بەم شێوە خێرایی یە واز لە ئایینی باپیرانی بهێنیٚ . . . بەلاٚم عەقل سەلماندی . . . بە تەنها ناتوانیٚ پەنا بیات بۆ نهێنی یەکان هەتا ڕادەیەکیش دلسۆز ڕاستگۆیێت . . .

فەرموو باگوێمان لەووتەکاتی ئیمامی (حەمزە) بێت کە چۆن ڕزگاری بوو لە دلە ڕاوکیٚ و گومان بۆئەوەی پەشیمان نەبێتەوە . . . . خۆی دەگێڕێتەوەو دەلیٚ :ـ ( . . . پاش ئەم کارەم پەشیمانیم بە دلٚ دا دەهات کەچۆن واز لە ئایینی باوک و باپیرانم بهێنم ، ئەم شتە وای کرد لەسەر ئەم دوو دلی و گومانە [illegible] ، خەو بە چاوم نەدەهات [illegible] پاش

ئەمە رووم کردە کەعبە . پاڕامەوە لە خوا کەوا سنگم گۆش بکات بۆ ڕێگای ڕاست و ، ئەم گومانەم لە دڵ دا لابچێ ، خوای گەورە دوعاکەی قەبول کردم و دڵی جۆش دام ...... بەیانی چوومە لای پێغەمبەر e ئەم بەسەرهاتەم بۆ گێڕایەوەو چۆن چۆنی ئیمانم هێناو !! پێغەمبەریش ﷺ دوعای بۆ کردم ، بۆ ئەوەی دڵم بچەسپێ لەسەر ئەم ئایینە] ، بەم جۆرە ئیمامی (حەمزە) بوو بە مسوڵمانێکی تەواو ...

خوا ئیسلامی بەرزکردەوە بە (حەمزە) ... هەروەک چیایەکی سەرکەشی بەهێز چەسپاو ، بەرگری کرد لە پێغەمبەری خواو هاوەڵەکانی ....

(ابو جهل) بینی وا ئیمامی (حەمزە) لەنێو مسوڵمانانە بۆی روون بووە چارەسەری تەنها شەڕە لەگەڵیان ، ڕۆیشت بۆ ئەوەی قورەیشیەکان هان بدات بۆ ئازاردانی پێغەمبەرو هاوەڵەکانی ، دەستی کرد بەدروست کردنی شەڕی ناوخۆیی تا بەم ڕێگایە بتوانێ حیقدو دوژمنایەتی ناو دڵی سارێژ بکات ....

هەر چەندە ئیمامی (حەمزە) نەیتوانی هەموو جۆرە ئازارێک لەسەر مسوڵمانان لابدا ، بەڵام موسڵمان بوونی بوو بە پەرژینێک بۆ پاراستنی مسوڵمانان ، وە بووە ڕێگا خۆشکەرێک بۆ مسوڵمان بوونی هۆزو تیرەکانی تر ، بە تایبەتی پاش مسوڵمان بوونی ئیمامی عومەر ، پۆل پۆل دەهاتنە ناو ئیسلام ...

هەر لەو ڕۆژەی ئیمامی (حەمزە) مسوڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند ، بریاریدا هەموو هێزو بازووی خۆی تەرخان بکات بۆ خزمەت کردنی ئایینی خوا ، بۆیە پێغەمبەر ئەم نازناوەی پێ بەخشی: [اسد الله ، واسد رسوله] – (شێری خوا.... شێری پێغەمبەرەکەی)

یەکەم سریە دەرچوو بۆ سەر دوژمن لە لایەن مسوڵمانانەوە بە سەرکردەی (حەمزە) بوو ..... لەکاتی بە یەک گەیشتنیان لە جەنگی (بدر) ، شێری خواو شێری پێغەمبەرەکەی شتی سەیرو سەمەرەی دروست کرد ....

پاشماوەی لەشکری قورەیشەکان لە بەدر گەڕایەوە مەککە پاش شکان وبێ هیوا بوونی ، (ابو سفیان) بەدڵ شکاوی وسەر شۆڕی گەڕایەوەو لەمەیدانی شەڕیشدا لاشەی گەورەکانی قورەیش بەجێما ، نموونەی : ابو جهل وعوتبەی کوڕی ڕەبیعە وشەیبەی کوری ڕەبیعەو ئومەیەی کوڕی خەلەف وعقبەی کوڕی معیط ، اسود کوڕی عبدالاسد المخزومي و وەلیدی کوڕی عوتبەو نەضەر کوڕی حاریث و عاص کوڕی سەعیدو طوعمەی کوڕی عەدی و دەیەهای تر لە گەورە پیاوانی قورەیش ..

بەم جۆرە قورەیشیەکان ئەم شکانەیان لەیاد نەچوو پاش گەڕانەوەیان بۆ مەککە ، بەڵکو خۆیان بۆ شەڕێکی تر ئامادە کرد ، بۆ گێڕانەوەی شەرەف و تۆڵەی کوژراوەکانیان ..... ئەوەبوو نەخشەیان بۆ ئەم شەڕەکێشا .

جەنگی ئوحد هاتە پێشەوە ، قورەیشیەکان گەورەو بچوکیان بەشداری ئەم شەڕەیان کرد هەروەها هۆزە عەرەبە هاوپەیمانەکانیشیان لە گەڵ بوو .....

بەم جۆرە قورەیشیەکان ئامانجی سەرەکیان لەم شەڕە سەری دوو پیاو بوو :
ئەوانیش پێغەمبەرو ئیمامی (حەمزە) بوو ....

پێش ئەوەی شەڕ دەست پێ بکا بە چەند رۆژێک .... پیاوێکیان دانا بۆ کوشتنی ئیمامی (حەمزە) ، بەندەیەکی حەبەشی ، شارەزاییەکی بێ ئەندازە لە رم هاوێشتن ، ئیش وکاری لە جەنگی ئەم جارە تەنها پیلان دانان بوو بۆ کوشتنی ئیمامی حەمزە ، ئەویش بە هاوێشتنی تەنها یەک رم ، وە تێشیان گەیاند تەنها خۆی خەریک دەکات بەم کارەی نەخشەیان بۆ کێشاوە ، ئەگەر چارەنووسی جەنگ بە چی بگات !!

بەڵێنیان پێدا بە پاداشتێکی مەزن. بە ئازاد بوونی لە کۆیلەیی و بەندایەتی ، ئەم پیاوەش ناوی (وحشی) بەندەی عبدالجبیر کوری موطعم بوو مامی جبیر لە شەڕی بەدردا کوژرا بوو ، لە بەر ئەوە جبیر پێی گووت :.

[برۆ بۆ شەڕ لەگەڵ ئەم خەڵکە ، ئەگەر (حەمزە)ت کوشت ، ئازادی]

پاشان یەکسەر رەوانەی لای (هیندی کچی عوتبە) کرا ، خێزانی (ابی سفیان) بۆ ئەوەی زیاتر هانی بدات ... هیند لە جەنگی بەدر باوک و مام و براو کوڕی کوژرا بوون .... دەیانگووت ئەمانە بەدەستی (حەمزە) کوژراون .

لە پێناوی ئەوە زۆربەی پیاوو ژنانی قورەیش سوور بوون لەسەر ئەوەی بچن بەشداری ئەم جەنگە بکەن بۆ هێنانەوەی سەری (حەمزە) ئەگەر بە هەر نرخێک بێت .....!!! پێش دەرچوونیان بۆ جەنگ بە چەند رۆژێک ، تەنها کاریان ئەوەبوو حیقدی دڵی خۆیان بهاوێنە دڵی (وەحشی) ...

بەڵێنیان بە (وحشی) دا ئەگەر سەرکەوتن بێنێت لەم کارەیدا ، پاداشتێکی وای خەڵات بکەن هەروەک ئافرەت لەکاتی بوکێنی بە دەستی دەهێنێ ، بەم جۆرە هیند پڕیدا ملوانکەو خشڵ وزێڕو لوئلوئەبەترخەکانی ملی وپساندی و ، چاوە بە فرمێسکە شێتانیەکەی زەق کردەوە لە وەحشی و پێی گووت :. [کل هذا لك ، ان قتلت حمزة] ....

هەموو ئەوانە بۆ تۆ ئەگەر (حەمزە)ت کوشت .... ئیتر وەحشی دەستی کرد بە خۆ ڕاهێنان بۆ جێ بەجێ کردنی ئەم پیلانە ..... لەبەر ئەوەی ئازاد دەکرێ و دەبێتە خاوەن ئەو هەموو زێڕەی ئافرەتانی قورەیش ... بەم چەشنە هەموو پیلانەکانیان بۆ کوشتنی ئیمامی حەمزە بوو ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ.
جەنگی ئوحد دەستی پێکرد ....
هەردوو لە شکرەکە پێک گەیشتن ... (حەمزە) چل وبەرگێکی جەنگی لەبەرەو بە پەڕی ووشتر مورخ داپۆشراوە بۆ دروست کردنی هەیبەت لە جەنگدا ....
(حەمزە) لە ناوەندی مەیدانی جەنگە ، دێ و دەڕواو دەسورێتەوە ، هەر یەکێک بۆلای دێت وەکو شێر کەوری دەکات ، تەنها سەریان لە لەشیان جوێ دەکاتەوە .... دەتگووت مردن بۆی مەرەخەست بووە ، هەر یەکێکی بویستایە دەگەیشتە سەری و سەری لە لەشی جودا دەکردەوە .
تا لە ئەنجامی ئەم جەنگەدا مسولمانان گەیشتن بە سەرکەوتنێکی یەکجارەکی و لەشکرە دۆڕاوەکەیان ئەوەی هەلات و ئەوەی کوژراو ئەوەی بە دیلگیرا .... ئەگەر هاتوو تیر هاوێژەکانی سەر چیایەکە شوێنەکانیان بەجێ نەهێشتبایە ... دانەبەزیبانە بۆ کۆکردنەوەی غەنیمەت و دەسکەوتەکانی جەنگ ، ئەم شوێنەیان چۆل نەکرد بایە بۆ سوارچاکانی قورەیش ، (جەنگی ئوحد) دەبووە گۆڕستانێک بۆ هەموو قورەیشەکان بە پیاو و ژن و حوشترەکانیان ...
سوارچاکە قورەیشەکان بە سەرکردەی (خالیدی کوڕی وەلید) لە پڕێکدا دایان بەسەر مسولمانان وشمشێرە ژەنگاویە شێت و هارەکانیان لێ بەکار هێنان ، سەر لە نوێ مسولمانان دەستیان داوە چەکەکانیان وخۆیان کۆکردەوە ، کە هەندێکیان چەکەکانیان دانا بوو کەبینیان قورەیش هەلاتن وشکان ...
پاش ئەوەی (حەمزە) ئەمەی بە چاوی خۆیبینی ، دووبارە هێزو چالاکیەکانی خۆی بەگڕدا .... لە چەپ وڕاست و پشتەوەو پێشەوەی شەڕی دەکرد ـ تا لەم کاتەدا نەخشەی (وحشی) دەست پێ دەکاو ، وا موراقەبەی (حەمزە) دەکا ، لە هەلێک دەگەڕێ بۆ ئەوەی بگات بەو ئامانجەی کەبۆی دانراوە ...
با بزانین (وحشی) چی دەلێت خۆی با باسی ئەم بەسەر هاتەمان بۆ بکا :
[ ...... من پیاوێکی حەبەشی بووم ، بەڕم هاوێژ بەناوبانگ بووم ، کەم جار لە هەدەف هێنان غەلەتم دەکرد ، کاتێک خەلک بە شەڕ خەریک بوون من بۆی دەرچووم

تەماشای (حەمزە)م دەکرد ، کاتێک بینیم لە نێو شەرکەرەکان ..... بە شمشێرەکەی شەرێکی وای دەکرد کەس خۆی لەبەر ڕانەدەگرت ....
(سوێند بەخوا من خۆم بۆ ئامادەکرد ..... ئەوم دەویست ، خۆم دابووە پەنای دارێک بۆ ئەوەی لێی نزیک ببمەوە ، (سباع کوڕی عبدالعزی) بۆی چووە پێشەوە ، ... کاتێک حەمزە ئەوی بینی وهاواری کرد :ـ وەرە بۆلام ئەی کوڕی هیچ پاشان لێدانێکی وای بۆکرد سەری پەل دا .....
(ئا لەم کاتانەدا ڕمەکەم دەهێناو دەبرد بۆ پێش وپاش ، هەتا هەلم بۆ ڕەخساو لە خوارەوەی ناوکم دا ، ڕمەکە لە نێو لاقەکانی هاتە دەرەوە ..... بۆم هەستاوە بێت بۆ لام ، بەلام کەوتە سەرزەوی و.... (چوومە سەر لاشەی حەمزەو ڕمەکەم دەرهێناو ، پاشان گەڕامەوە سەربازگە ، هیچ کاری ترم نەبا ـ حەمزەم کوشت وئازاد کرام ....).
کاتێک مسولمانان دەرچوون بۆ جەنگی (یەمامە)ی هەلگەڕاوەکان ، منیش خۆم و ڕمەکەم ئەو ڕمەی حەمزەم پێ کوشت چووم لەگەلیان ، کاتێک جەنگاوەران خەریکی شەڕ بوون ، بینیم (مسیلمە)ی درۆزن ڕاوەستاوە ، شمشێرێکی بە دەستەوەیە ، خۆم بۆ ئامادەکردو ڕمەکەم هێناو برد بۆ پاش وپێش ، هەتا هەدەفم لێ گرت ولێم دا .....
(ئەگەر بەم ڕمە چاکترین مرۆڤم کوشتبێ ، ئەویش (حەمزە) بوو ..... داواکارم لە خوای گەورە لێم خۆش بێت ، لەبەر ئەوەی خراپترین کەسیشم بۆ کوشتووە ئەویش (مسیلمە)یە)
بەم جۆرە شێری خواو شێری پێغەمبەرەکەی شەهیدکرا ....
چۆن لە دونیا ئازایەتی یەکەی سەدای داوە ، مردنەکەشی بەم جۆرە سەدای داوە ..... دوژمنانی ئیسلام بە شەهید کردنی ئیمامی (حەمزە) خوا لێی ڕازی بێت ، دلیان داکەوت ... چونکە ئەم دوژمنانە هەموو پیاووسامانیان تەرخان کرد تەنها بۆ کوشتنی ئیمامی حەمزە و پێغەمبەرەکەی ﷺ ..........
(هندی کچی عوتبە) خێزانی ابی سفیان فەرمانی کرد بە (وحشی) جەرگی حەمزەی بۆ بهێنێ ، ئەم حەبەشیەش ئەو ئارەزووە هارەی بەجێ گەیاندو ، کاتێ گەیشتەوە لای هیند جەرگی حەمزەی بە دەستی ڕاستەوە بوو ، زێڕو خشلەکانیشی بە دەستی چەپیەوە بوو گەمەی پێدەکرد ، ئەو زێڕو خشلەی لە پاداشتی ئەو میهمە بوو کە پێی سپاردرا بوو ....

بەم شێوەیە هیند جەرگی حەمزەی بە زمان دەلێسێتەوە لە تۆڵەی ئەوەی کە براو مام وباوکی لە جەنگی بەدر کوژرا بوون ، جەرگی حەمزەی دەکرۆشت دەیویست بیخوات بەلام بۆی قووت نەدەدرا .... تاکو چووە شوێنێکی بڵندو هاواری کرد !

نحن جزيناكم بيوم بدر     والحرب بعد الحرب ذات سعر
ما كان عن عتبة لي من صبر     ولا اخي ، وعمه ، وبكري
شفيت نفسي وقضيت نذري     ازاح وحشي غليل صدري

بەم جۆرە جەنگ کۆتایی هات و ، قورەیشیەکان سواری حوشتر و ئەسپەکانیان بوون و ، کاروانیان لێخوڕی و بەرەو مەککە بەڕێ کەوتن .

پاش ئەوەی مەککە فەتح کرا هەڵاتم بۆ تائیف ....

(کاتێک وەفدی تائیف هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوەی مسوڵمان بن ، من ڕێگام لێ تێک چوو نەمزانی خۆم بگەیەنە شام ، یان یەمەن) .......

(سوێند بە خوا من لەو گرفتەدا بووم ، پیاوێک پێی گووتم : خاکت بە سەر ...!! پێغەمبەری خوا ﷺ ، والله ، یەکێک ناکوژێت بێتە ناو ئایینەکەی ......

(بۆی دەرچووم ، کەس نەیبینم چوومە بەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەبوو لەپێشی شەهادەی هەقم هێنا ، کاتێک منی بینی فەرمووی :. تۆیت وەحشی ؟!! گووتم : بەڵی .... ئەی پێغەمبەری خوا .... پێی فەرمووم : پێم بڵێ چۆن حەمزەت کوشت .... منیش بۆم گێڕایەوە .... کاتێک لە قسەکانم تەواو بووم ، فەرمووی :

(ويحک ..... غيب عني وجهک) خاکت بەسەر ، دەم و چاوت لە پێشم بزرکە ...

بەم جۆرە خۆم لە پێغەمبەری خوا دەشاردەوە ، لە هەر شوێنێک بایە ، تاکو پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد ....

پێغەمبەری خوا و هاوەڵەکانی گەڕانەوە مەیدانی شەڕەکە ..... بۆ ئەوەی شەهیدەکان بەسەر بکەنەوە ، لە ناوەندی دۆڵەکە دەگەڕان لە دوای ئەوانەی خۆیان بۆ خوا فرۆشتبوو ، بە پێوە ڕاوەستا بوو .... تەماشای شەهیدەکانی دەکردو ، ددانەکانی لێکدەداو لێوەکانی خۆی دەکرۆشت.....

بەهیچ جۆرێک لەم باوەڕەدا نەبوو ، عەرەبەکان ئەو دڕندایەتی یە قەبول بکەن ، بەم جۆرە دەسکاری لاشەی مردوو بکەن .... لە کاتێکدا تەماشای لاشەی مامی خۆشەویستی و شەهید (حەمزەی کوڕی عبدالمطلب ) شێری خواو پێغەمبەرەکەی و

پێشەوای شەهیدانی دەکردو ، دەیگووت :ـ هیچ زەمانێک کارەساتی وەک ئەم کارەساتەم بەسەر نەهاتووە ، کە بە سەر تۆیان هێناوە ... !!!

هیچ کاتێک تووشی مەوقیفی ئەوها نەهاتووم ، کەپێم ناخۆش بێ وەک ئەم مەوقیفە)!!! پاشان رووی لە ئەصحابەکان کردو فەرمووی :ـ

(ئەگەر لەبەر صفیەی خوشکی حمزە نەبێت خەم بخوات ، لاشەی حەمزەم بەجێ دەهێشت تاکو دەچووە سکی درندەو باڵندان ، ئەگەر خوا پشتیوانم بکات لە شەڕدا دژی قورەیشەکان ، دەبێ منیش وەدەسکاری سی پیاو لە پیاوەکانیان بکەم) .

صەحابیەکانیش هاواریان کردو گووتیان : [ سوێند بە خوا ، ئەگەر دەستمان بدا ڕۆژێک ، دەبێ ئەوها دەسکاری لاشەکانیان بکەین ..... عەرەب قەد بە چاوی خۆیان نەیان دیتبێ) ... !! بەلاّم مسوڵمانان ئاگادارکرانەوە کە دەسکاری لەگەل لاشەی مردوو ناکرێت ، خوای گەورە ڕێزی لە (حەمزە) نا بە پلەی شەهادەت ..... جارێکی تر دەیکات بەنموونە بۆ ئەوەی دەرس وعیبرەت وەرگرن لە شەهادەتەکەی ..... بەم جۆرە پێغەمبەر ﷺ لە قسان نەبوو بۆوە .... ئیگای بۆ هاتە خوارەوە ، کە دەفەرموێ:ـ

(ادع الى سبيل ربك بالحكمة والموعظة الحسنة ، وجادلهم بالتي هي احسن ، ان ربك هو اعلم بمن ضل عن سبيله ، وهو اعلم بالمهتدين .... وان عاقبتم فعاقبوا بمثل ما عوقبتم به ، ولئن صبرتم لهو خير للصابرين .... واصبر ، وما صبرك الا بالله ، ولا تحزن عليهم ، ولا تك في ضيق مما يمكرون .... ان الله مع الذين اتقوا ، والذين هم محسنون) .

هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە لەم شوێنە گەورەترین ڕێز لێنان بوو بۆ ئیمامی حەمزە ، کەوا پاداشتی کەوتە لای خوای گەورە ....

پێغەمبەر ﷺ لەم جەنگە گەورەترین خۆشەویستی لە دەست داهەروەک باسمان کرد لە پێشەوە ....

پێغەمبەر ﷺ نەیدەزانی چۆن ئەم شەهیدانە بە جێ بهێڵێ لە مەیدانی جەنگدا ، ئەوە بوو یەکەم جار فەرمانی‌دا لاشەی پیرۆزی ئیمامی حەمزەیان هێناو نوێژی لەسەر کرد ، پاشان یەک یەک شەهیدەکانی تریشیان هێنا ، لە تەنیشت ئیمامی حەمزە دایان دەناو نوێژی لەسەر دەکردن .... تاکو حەفتا نوێژی لەسەر مامە خۆشەویستەکەی کرد....

پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە بۆ ماڵەوە بینی ژنانی نەوەی (عبد الاشهل) دەگریێن لەسەر شەهیدەکانیان ، پێغەمبەر ﷺ لەبەر زیاد خۆشەویستنی ئیمامی حەمزە فەرمووی :. (لکن حمزە لا بواکی لە) بەلاّم حەمزە کەس نیە بۆی بگریێ ... (سعدی کوڕی معاذ) گوێی لەم ووتەیەی پێغەمبەر بوو ، یەکسەر فەرمانی دا بەژنانی نەوەی (عبد الاشهل) بۆحەمزە بگرییێن ..... وای زانی پێغەمبەر ﷺ بەم کارە دڵی خۆش دەبێ .... ژنەکانیش فەرمانەکەیان بە جێ گەیاند ... هەر کە پێغەمبەر ﷺ گوێی لەم گریانە بوو ، بە ژنەکانی گووت : [قەصدم ئەوە نەبوو ، بگەڕێنەوە خوا ڕەحمتان پێ بکات ، لەم ڕۆوە گریان نەما] ...

پێغەمبەر ﷺ ئەوەندەی هەوڵی دەدا نەیدەتوای چۆن دڵی خۆی بداتەوە ، بۆ ئەوەی شەهید بوونی مامی لەیاد بچێ ، چونکە دەیزانی بەشەهید بوونی ئەم زاتە پیرۆزە ، گەورەترین زیان لە ڕابوونەکەی کەوتووە .... لە نێوان ئوحدو مەدینەدا چاوی دەکەوێت ، بە ئافرەتێک کەوا کوڕو مێردو برای لە دەست داوە ...!! ئەم ئافرەتە کاتێک بینی خەڵک دەگەڕێتەوە لە جەنگ یەکسەر بێ سێو دوو پرسیاری لێ کردن دەربارەی دەنگ وباس ، ئەوانیش هەواڵی شەهید بوونی کوڕو براو مێردیان پێ گووت !! یەکسەر ئافرەتەکە گووتی :. پێغەمبەری خوا ﷺ چی بەسەر هاتووە ؟!!

وەلاّمیان داوە گووتیان : سەلامەتە ، چۆنی تۆ حەز دەکەیت.. !!!

ئافرەتەکە گووتی :. پێم نیشان دەن بۆ ئەوەی ببینم !!!

هەتا لە پێغەمبەری خوا ﷺ نزیک بۆوەو پێی گووت:.

[هەر کارەساتێک لە دوای تۆ .. ئاسانە]

بەم جۆرە پێغەمبەر ﷺ تەمی خەم و خەفەت لە دڵی ڕەویەو کاتێک ئەو هەڵوێستە بەهێزەی لەم ئافرەتە ئازاو لە خواترس و خۆڕاگرو بڕوادارە بینی ، ئافرەتێکی بێ هێزی هەژاری وا لەیەک کاتدا باوک و مێردو کوڕی لەسەر دانا ... لەسەر ئەم کارەساتەش دەپرسێ:

حاڵی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆنە ؟؟!!

ڕەحمەتی خوا لە پێشەوای شەهیدان و شێری خواو پێغەمبەرەکەی و هەموو شەهیدانی بەرگری لە ئیسلام و موسڵمانان.

﴿٤﴾

# عەماری کوڕی یاسر

## ئەو کەسەی بەهەشت بۆی بەپەرۆشە

خوای گەورە دەفەرمووێ : (والسابقون السابقون ، اولئك المقربون ، في جنات النعيم) مەبەست لە ووشەی (السابقون) ئەو کەسەیە بە پەلەو بەخێرایی دەگاتە کرداری چاکە هەرکەسێک لەم دونیایە خێرو چاکەی زۆر بوو ، ئەوا لە ڕۆژی دوایی لەو کەسانەیە کەرێزی لی دەگیرێ .... هەروەها موفەسیرەکان ئەم ئایەتە بەچەند مانایەک لێک دەدەنەوە :-

هەندێک دەڵێن ئەو کەسانەن بەخێرایی بەرەو پیری ئیمان هاتوون ، یان ئەو کەسانەن کە لە سەرەتای پەیدابوونی ئیسلام ، بوونە موسڵمان ، یان ئەوانەن نوێژیان لە هەردوو قیبلەکان کردووە ، یان ئەو کەسانەن بەپەلە دەگەنە مزگەوت وجیهاد لە پێناوی خوا دەکەن .... بەڵێ ئەم سیفەتانەی موفەسیرەکان باسی لێوەدەکەن هەمووی لە عەمار دێتە جێ عەمار صەحابە یەکی بەرێزی پێغەمبەرە (ﷺ) باوکی یەقظان عەماری کوڕی یاسر کوڕی عامری عەنەیسی یە .... یەکێکە لە موسڵمانە یەکەمەکان ، لە گەڵ براکەی عبداللە ، وەباوکی یاسر ، وەدایکی سومەیەی کچی خەباط کەوا جاریەبوو لای ابی حذیفە ، پاشان بووە خێزانی یاسر باوکی عەمار ... ئەم ئافرەتە یەکەم شەهیدە لە مێژووی ئیسلام ... (ابو جهل) نەفرەتی خوای گەورەی لی بێ ، بەشێوەیەکی زۆر دڕندانە شەهیدی کرد ، کاتێک بەرمێک دای لە سنگی و شەهیدی کرد ... (ابو جهل) بێ ئابڕوویی و ڕووزەردی بۆماوە ... سومەیەش بەپلەی بەرزی شەهیدی گەیشت .

عەمار لەگەڵ صوهەیبی رومی لە یەک کاتدا بوون بە موسڵمان ، لەماڵی ئەرقەمی کوڕی ابی الارقم ، ئەوانەی لەم کاتەدا بوونە مسوڵمان ژمارەیان سی کەس نەدەبوو ، عەماریش یەکێک بوو لەمانە موسڵمانەتی خۆی ڕاگەیاند ... وەک و ابو بکر و بیلال وخەباب و صوهەیب ، بەمە تووشی جۆرەها ئێش وئازارو تەنگ وچەڵەمە بوون ...

کاتێک عەمار لەگەڵ باوک ودایک وبراکەی ئازار دەدران لەپێناوی خوا لە بەر ئەوەی موسڵمان بوون ... کاتیک پێغەمبەر (ﷺ) بەلایان تێدەپەڕی و ئەوانیش ئازار

دەدران ، پێغەمبەریش (ﷺ) لەو کاتەدا هیچی بۆ پێندەکران بۆ ئەوەی بەرگریان لێبکات ، پێغەمبەر (ﷺ) پێی دەفەرموون : (صبرا ال یاسر فان موعدکم الجنة).... هەر لەو کاتانەدا ئازارو تەعزیب لەسەر عەمار زۆر توند ببوو پێغەمبەر (ﷺ) بەلای دا تێپەڕیو ، عەمار پێی گووت ئەی پێغەمبەری خوا ، ئازارو تەعزیب لە سەرمان زۆر توند بووە !!

پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو :- (صبرا ابا الیقظان صبرا ال یاسر فان موعدکم الجنة).... ئارام بگرە باوکی یەقظان ، ئارام بگرن ئەوەی یاسر جێگاتان بەهەشتە .

گاورەکانی مەکە ئەوەندە لە ڕادە دەرچوون لە ئازار دانی عەمار تاوای لێهات ، لەشی عەماریان هەموو بەئاگرداخ کرد ، پێغەمبەر (ﷺ) دوعای بۆ عەمار کردو فەرمووی : (یا نار کونی بردا وسلاما علی عمار ، کما کنت بردا وسلاما علی ابراهیم) . . . . ئەی ئاگر فێنک وسەلامەت بە لەسەر عەمار ، هەروەک فێنک و سەلامەت بووی لەسەر ابراهیم ... هەتا دەهات ئازارو تەعزیبیان لە سەر عەمار زیاد دەکرد ... تاوای لێهات ئەهۆش خۆچوو ، ئەیدەزانی چی دەکاو چی دەڵێ ، گاورەکان فەرمانیان کرد بە گووتنی چەند ووشەیەک دژی ئیسلام ، ئەویش ووتەکانی دووبارە کردەوە بەبێ ئەوەی بزانێ چی دەڵێ ... بەڵام پاش ئەوەی بەخۆ هاتەوە زانی چی گوتووە ، زۆرخەمی خوارد ، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) دڵی داوەو پێی فەرموو ، ئەگەر گەڕانەوە سەرت ، چیت گووتوە هەر ئەوە بڵێ ..

بەم بۆنەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە : (الا من اکره وقلبه مطمئن بالایمان) . وەلەسەر عەمارو ئەوانەی بەم چەشنە ئازار دەدرێن ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە : (والذین هاجروا في الله من بعد ماظلموا لنبوئنهم في الدنیا حسنة ، ولدار الاخرة اکبر لو کانوا یعلمون).

عەمار لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) کۆچی کرد بۆ مەدینە ، بەشداری غەزای بەدرو ئوحدو خەندەق وهەموو غەزاکانی تری کرد .... پاش کۆچ کردن ، عەمار بەشداری دروست کردنی مزگەوتی پێغەمبەری (ﷺ) کرد ... لەکاتی دروست کردنی مزگەوت صەحابیەکان خشت خشت و بەرد بەردیان هەڵدەگرت ، بەڵام عەمار دوو دووخشت وبەردی هەڵدەگرت ، وای دانا بوو خشتێک لە جیاتی خۆی ، ئەوی تریش لەجیاتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : (بۆ خەڵک خێریک دەنوسری بۆ

عەمار دوو خێر ، وە ئاخیر خواردنت قومێک شیره ، وە دەستەیەکی ناهەق دەتکوژن) .. بانگیان دەکەی بۆ بەهەشت ، ئەوانیش بانگت دەکەن بۆ ئاگری پاشان پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو :- ئەی باوکی یە قظان ، خۆت ماندوو مەکە ، عەمار گووتی :- ئەی پێغەمبەر خوا ، من حەز دەکەم لەم مزگەوتە ئیش بکەم . پێغەمبەر (ﷺ) بە عەماری فەرموو :- (انت من اهل الجنة ، وتقتلك الفئة الباغية). تۆ بەهەشتیت وچینێکی ناهەق دەتکوژن .

## (بەهەشت بۆ عەمار بە پەرۆشە)

بەهۆی کردەوە جوانەکان وقسە خۆشەکان و ڕەوشت وهەستی عەمار دەتگوت یەک پارچە (نورە) لەسەر زەوی دەسوڕێتەوە دەورو بەری خۆی ڕووناک دەکردەوە ئەمەش بەڵگەی ئیمان و دڵسۆزی بوو بۆ ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ ، بۆیە پێغەمبەر خوا ﷺ دەرهەقی دەفەرمووێ :- (لقد ملئ عمار ايمانا الى مشاشة) . واتە بەڕاستی عەمار ئیمانی واتەواو پڕ بووە ، تاکو سەر ئێسکی چووە !!!!

پێغەمبەر ﷺ دیسان دەفەرمووێ :- بەڕاستی عەمار نێوچەوانی دەگەشێتەوە :- (اشتاقت الجنه لعمار) ... بەهەشت بۆ عەمار بە پەرۆشە . دەگێڕنەوە عەماری کوڕی یاسر هاتە لای پێغەمبەر خوا ﷺ ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ڕێگام پێ بدەن ، بەخێربێت پاکی پاکراو .... حوزیفە دەگێڕێتەوە دەڵێ :- لەلای پێغەمبەر ﷺ دانیشتبووین ، پێغەمبەر فەرمووی :- من نازانم چەندم ماوە لای ئێوە ، (اقتدی) بکەن بە ئەوانەی دوایی من ، دەستی درێژ کرد بۆ ئیمامی عومەرو ئەبو بکر - بەدوای ڕێگای ڕاستی عەمار بکەون ، هەر قسەیەکیش (ابن مسعود) بۆی گێڕانەوە باوەڕی پێ بکەن) .

بەم جۆرە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ :- (عەمار ئەگەر دوو ڕێگای لە پێش بوو ڕێگا چاکەکە هەڵدەبژێرێ ، ئێوەش بەدوای بکەون) .

چەند ساڵ ڕۆژێک بە سەرچوو ، عەماری موجاهید پاکی پاکراو وەکو فریشتە دەسوڕایەوە لە نێوان موجاهیدان بە خۆی و شمشێرەکەی هەر لە جیهادو تێکۆشان بوو ، بەبێ ئەوەی ماندووبێت دەهات و دەچوو ، وەکو بەندەیەکی موجاهید بانگی خەلکی دەکرد بۆ ئاینی خوا ، بەبێ درێغی و کەم و کورتی ، هەمووکات گیانی خۆی لەسەر دەستی دانابوو بەم دوو هیوایە :-

یان سەرکەوتنی ئیسلام و ڕێبازەکەی ، یان بەخشینی ڕۆحی لە پێناو خـوای گەورە ... بۆ ئەوەی بەزووترین کات بگات بە بەهەشت و پێغەمبەرەکەی ....

دەتگووت ووشەکانی عەمار بانگی خودایی و ئەوەندە سەرنج ڕاکێشەرو بەکار بوون خەڵکی بۆی دەهاتن وخۆیان بۆ ئامادە دەکردو بەردەوام دەبوون لەجیهاد ... عەماریش پێش برکێی لە گەڵ دەکردن و لەریزی هەرە پێشەوە بوو ، هەتا گوێیەکی لـە دەست دا لـە شەڕ گەورەترین شەڕی دەکرد بەبێ ئەوەی هەست بـە ئازاری گـوێی بکـات ... هـەروەها عـەمار پیـاوێکی بـێ گـازاندەو پرتـەو بۆڵـە بـوو ، لـە هـەموو کەسـێک کەمتر قسەی دەکردو بێ دەنگ بوو ...

چەند ساڵێکی تر لە ژیانی تێ پەڕی ... بەڵێ عەمار دوو کۆچی بۆ خواکـرد نوێژی بەرامبەر دوو قیبلەکرد ، هەر ماوە لەسەر ڕێبازی ڕاستەقینەی ئیسلام و لـیی لانـەداو ، بەقەدەر مویەک لـیی دوور نەکەوتەوە .... لەهەموو بوارێکی چاکە بەشداری دەکـرد ، هەموو توانای خۆی سەرف دەکرد لەپێناوی خوا ، بە گوێرەی پێویست شارەزایی لـە ئیسلام هەبوو ، یەکەم نمونە بـوو بـۆ دروست کردنـی مزگـەوتی پێغەمبـەر (ﷺ) لـە مێژووی ئیسلام دا ، هەروەها مزگەوتی (قـەبا) شی دروست کرد ، زیاتر لـە شەست فەرموودەی پێغەمبەری (ﷺ) گێڕایـتەوە ، هەروەها لایـەنی چاکـەی سەردەخست و ، دژی خراپـەکاری دەوەسـتا ، بەمـەش فـەرموودەی پێغەمبـەر (ﷺ) دێتـە جـێ کـە فەرموویەتی :-

(یا عمار ، انك لتحبنا ، وانا لنحبك ، وانك لمن الاعوان علی الخیر ، المثبطین عن الشر)

واتـە :- (ئـەی عـەمار ، ئێمـەت خـۆش دەوێ ، ئێمـەش تۆمـان خـۆش دەوێ ، تـۆ یاریدەدەری لەسەر کاری چاکە ، سارد کەرەوەی لەسەرکاری خراپە) .

ئیمامی عومەر (خوالـیی ڕازی بێت) عەماری کرد بە جێگری (سعدی کوڕی ابـی وقاص) لە سەر ویلایـەتی کوفـە ساڵی ۲۱ کۆچی ، ئـەوەبوو زۆر بـە چاکی کارەکـانی خـۆی بـەجێ گـەیاندو ، سـاڵی دووەم بـوو بـە والی کوفـە .... وە بەشـداری گرتنـی خوزستانی کرد .

چەند نموونەیەک لـە ووشەکانی عـەمار لـە سەر پـاکی دەروونـی جیهـادی کـەوا بەردەوام بوو لـە تێکۆشان بۆ سەرخستنی ڕێگای هـەق ... وەسوور بـوو لەسـەر ئەوەی خوا لەخۆی ڕازی بکات ، بە گوێرەی عەقیدەو باوەڕی خۆی ، دەیگووت :-

(پەروەردگارا ، تۆ دەزانیت ئەگەر ڕازی بی لێم بەوەی خۆم بهاوێژمە ناو ئەو دەریایە ئەوا بەدوا ناکەوم ، پەروەردگارا تۆ دەزانیت ئەگەر ڕازی بی لێم بەوەی زگی خۆم لەسەر ئەم شمشێرە دابنێم و لەپشتم بێتە دەرەوە ، ئەوا ئامادەم بیکەم خوایە دەزانم بەوەی فێرت کردووم من کردەوەیەک ناکەم لەوە باشترکە جیهادە ، لەگەڵ ئەو لەڕێ دەرچووانە ، ئەگەر بمزانیبا کردەوەیەک لەمە باشتر هەیە دەمکرد) .

پاش ئەوەی پێغەمبەر خوا (ﷺ) کەگەیشتە بارەگای پەروەردگار وەفاتی کرد ، موسڵمانان پاش ئەمە بەرەنگاری زۆر لە جەنگی هەڵگەڕاوەکان بوون ، یەکێک لەم جەنگە گەورانە جەنگی یەمامە بوو . کەوا عەمار بەشداری تیاکرد کاتێک موسڵمانان تووشی شکستی و شکان دەبوون ، عەمار دەچووە سەر شوێنێکی بڵندو بانگی ئەوانەی دەکردەوە کە تووشی وورە ڕوخان و بێهێزی دەبوون .... دەیگووت : ئەی موسڵمانان ، ئایا لە بەهەشت هەڵدێن ؟! وەرنەلام وەرنەلام ، من عەمار کوڕی یاسرم !!!

یەکێک لە دروشمە جوانەکانی جیهادی عەمار دەیگوت :- (ایها الناس ، الرواح الی الجنة) . واتە (ئەی خەڵکینە ، ڕۆیشتنمان بۆ بەهەشتە) ... یان دەڵێت :- (ئارام بگرن ، بەهەشت لەژێر سێبەری شمشێرانە) .

بەم جۆرە عەمار بلیمەت ودانا بوو لە کردەوەو وتەکانی ... نموونەی موسڵمانێکی ئازا لە جوڵانەوەو هەڵس وکەوتی ، بۆیە حەزرەتی عائیشە دایکی موسڵمانان (خوا لیی ڕازی بێ) فەرمووی دەربارەی عەمار : هیچ ووتەیەکم لەسەر صەحابیەک ویستبم بیڵێم ووتومە لای پێغەمبەر :- تەنها عەماری کوڕی یاسر نەبێت ، پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی دەیفەرموو (أنه ملئ ایمانا الی اخمص قدمیه)

واتە : عەمار بووە پارچەیەک ئیمان ، تاکو بنی پێی داگرتووە ..

عبدالله ی کوڕی عباس دەربارەی تەفسیری ئەم ئایەتە :- (او من كان ميتا فاحييناه وجعلنا له نورا يمشي به في الناس ، كمن مثله في الظلمات ليس بخارج منها) دەڵێت :- ئەو کەسەی خوای گەورە ئیمانی پێ بەخشیووە عەماری کوڕی یاسرە ، ئەو کەسەی لەناو تاریکیشە (ابو جهل)ە .

عەمار پیاوێکی وەفاداری ئیسلام بوو لە سەردەمی خەلیفایەتی ابو بکرو عمرو عثمان (خوا لییان ڕازی بێت) ، تاکو سەردەمی خەلیفەی چوارەم ئیمام علی (خوا لیی ڕازی بێت) دەستی بەهێزی ئیمانداری لە دژی ناهەق و بەرگری لەهەق

ڕاست کردەوەو . عەماری کوڕی یاسر لە سەنگەرەکانی هەرە پێشەوەی ئیمام عەلی بوو ... بۆیە ئیمام عەلی (خوالیی ڕازی بێت) دەیکردە پێشەوای سوپای پیادەو جارێکی تر دەیکردە پێشەوای سوپای سوارچاکان .

عەمار زۆر بە پەرۆش بوو بۆ ئەوەی ڕووبەرووبیبێتەوە دژی لەرێ دەرچوەکان تاکو لەکەلی شەیتان بێنەخوارەوەو ڕێگای ڕاستی ئیسلام بگرنەوەو ڕێگای ناهەق بەجێ بهێڵن .. بەم چەشنە هەڵسو کەوتانە ، خۆی لە خوای گەورە نزیک دەکردەوە ، پێش جەنگی (صفین) بە ئیمام عەلی فەرموو :-(ئەی ئەمیری بڕواداران ، ئەگەر دەتوانی ڕۆژێک نەمێنیەوە ئەوە وابکە ، کۆمان بکەوە پێش ئەوی ئاگری پیاو خراپان بڵێسەدار بێ ، وەپێش ئەوە ڕایان کۆکەنەوە لە سەر گوێ ڕایەڵی نەکردن و جیا بوونەوە ، بانگەوازیان کە بۆ هاتنەوە سەر هۆش و بیر ، جا ئەگەر ڕەزامەند بوون ئەوە بەختەوەر دەبن ئەگەر نا جەنگیان لەگەڵ دەکەین ، چونکە سوێند بەخوا خوێن ڕشتنیان وجیهادکردن لەگەڵیان نزیک بوونەوەیە لەخوای گەورەو مایەی سەربەرزیشە لای خودای مەزن) .

عەمار لەم جەنگەدا خۆڕاگر ماوە لە ژێر سەرۆکایەتی ئیمام عەلی (خوالیی ڕازی بێ) داواکردنی یەکێک لەم دوو داواکاریانە : (یان سەرخستنی هەق ، یان شەهادەتێک خاوەنەکەی ببا بۆ بەهەشت) ئەم بەیتە شیعرانەی دەگووتەوە ، کەدەڵێت:-

| | |
|---|---|
| كلا ورب البيت لا أبرح أرضي | حتى أموت أو أرى ما أشتهي |
| لأفتا الدهر احامي عن علي | صهر الرسول ذي الأمانات الوفي |
| ينصرنا رب السموات العلي | ويقطع الهام بحد المشرفي |
| لمنحنا النصر على من يبتغي | ظلما علينا جاهلا" ما يأتلي |

صەحابییەکان لە ڕۆژی (صفین) بەدوای عەمار دەکەوتن لەهەر شوێنێک بوایە .. دەیانزانی لەگەڵ دەستەی بڕوادارانە بەگوێرەی فەرموودەی پاکی پێغەمبەر (ﷺ) (ويح عمار ، تقتله الفئة الباغية) واتە (ئاخ بۆ عەمار لەهەق لادراوەکان دەیکوژن)

حەزی خوای گەورە وابوو عەمار لەم جەنگە تامی شەهادەت بچێژێ ، لە مانگی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی ٣٧ کۆچی لەشەڕی (صفین) ، لە تەمەنی ٩٣ساڵی دا ئەوەی جێی سەر سوڕمانە ئەم تەمەنە درێژەی عەمار ، دوای نەخست لە کاروانی جیهاد وخۆ بەقوربانی دان .. پاش ئەوەی بریندار بوو هەستی بەنزیک بوونەوەی مەرگ کرد ،

گووتی :- إئتوني بشربة لبن ..واته: قومێک شیرم بۆبهێنن .. من گوتم له پێغەمبەر بوو (ﷺ) پێی گووتم ئاخیر قومت لەدونیا کە دەیخۆیتەوە ، قومێک شیره!!

پاشان وەسیەتی کرد بەجل و بەرگی خۆی بینێژن ، ئیمام عەلی (خ.ر) وەسیەتەکەی بەجێ گەیاندو بەجلی خۆی ناشتی ، وەهەروەها پێش ئەوەی گیانی پاکی دەربچێ دەیفەرموو :- الجنة تحت الأسنة ، اليوم ألقى الأحبة محمدا" وحزبه !!

واته : بەهەشت لە ژێر سێبەری شمشێر دایە ، ئیمرۆ دەگەمە پێغەمبەرو یارانی ..

بەڵێ ئەو نیازو مەبەستەی عەمار هاتە جێو گەیشت بە پێغەمبەران و شەهیدان و ڕاستگۆیان و پیاوچاکان .. بەڕاستی ئەوەش باشترین و چاکترین مەبەست بوو ، بۆ ئەوەی عەمار پێیان بگات ...

خوای گەورە لە عەمار وباوکی ودایکی وئیمامی عەلی و یاوەرە بەڕێزەکانی خۆش بێت .

﴿٥﴾

# عوبەیدەی کوڕی حاریث

پێویستە لە یادمان نەچێت ئەوانەی لەپێش هەموو کەسێک خۆیان دەکردە قوربانی بۆ ڕێگای ئیسلام ، هەروەها دەست پێشخەریان دەکرد بۆ شەهید بوون ، ئەوانە بەرێزترو گەورەترن لای خودا لە کەسانی تر ، هەرچەندە کردەوەکەیان زۆر بێت یان کەم .... هەروەک خوای گەورە دەرهەقیان دەفەرموێ : (والسابقون السابقون ، اولئك المقربون) ...

ئەمەش یەکێکە لەو پێشەنگە موجاهیدە گیان لەسەر دەستانەی قوتابخانەی پێغەمبەرمان محمد ﷺ عوبەیدەی کوڕی حارثی مطلبي کوڕی عبد مناف ، پێش ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بچێتە مالی ئەرقەمی کوڕی ئەرقەم ، عوبەیدە بوو بە موسلمان ، هەروەها عوبەیدە لەگەڵ (ابو سلمەی کوڕی عبدالاسد وعبدالله ی کوڕی ئەرقەم وعوسمان کوڕی مظعون (خوا لێیان ڕازی بێت) لەیەک کاتدا بەیەکەوە بوونە موسلمان .

عوبەیدە (خوا لێی ڕازی بێت) جێگاو ڕێزەکی تایبەتی هەبوو لای پێغەمبەر e هەروەک مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە لەگەل هەردوو براکەی (طفیل) و (حصین) کۆچیان کرد بۆ خودا ، بۆ مەدینەی شاری پێغەمبەر ﷺ.

پێغەمبەری خوا ﷺ عوبەیدەو عومەیری کوڕی حومامی موجاهیدی شەهیدی کردە برا ، ئەو عومەیرەی پێش دەست پێ کردنی جەنگی بەدر گوێی لە پێغەمبەر خوا ﷺ بوو دەیفەرموو : (بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە ، هەر کەسێک لەم ڕۆژەدا بکوژرێت بە مەرجێک خۆڕاگرو نیەتی بۆ خوابێت ، لە پێشەوە لێی بدرێت ، (واتە پشت لە دوژمن نەکات) ، خوای گەورە دەیباتە بەهەشت) .

کاتێک عومەیر گوێی لەمە دەبێت دەڵێت : ( بخ بخ ، افما بيني وبين ان ادخل الجنة الا ان يقتلني هؤلاء ؟) واتە (ئەی ئەی !! ئایا نێوانی من وئەوان بۆ ئەوەی بچمە بەهەشت، تەنها ئەوەیە ئەوان بمکوژن ؟) .

هەندێک خورمای لە دەست بوو بیخوا ، فڕێی داو گووتی : (والله لئن بقيت حتى اكل هذه الثمرات ، انها لحياة طويلة) . واتە (بەو خوایە ، ئەگەر بمێنم تاکو

ئەم خورمایانە بخۆم ، ئەوە ژیانێکی درێژە) . دەستی‌دا شمشێرەکەی و بە پەلـە بـەرەو پیری مەرگ چوو ، چووە ناو مەیدانی جەنگەوە ، وەئەم پارچە شیعرەی دەگووت:

رکضا الی الله بغـــیر زاد　　الا التقی وعمل المعاد
والصبر في الله علی الجهاد　　وکل زاد عرضة النفاد
غیر التقی والبر والرشاد

لەمانگی شەوالی سالّی یەکەمی کۆچی پێغەمبەر ﷺ عوبەیدەی لەگەلّ سریەکی گیان لەسەر دەست ، کە پێک هاتبوون لە (٦٠) سواریان (٨٠) سوار هەموویان لـە کۆچ کردووەکانی خەلّکی مەککە بوون ، پێغەمبەر ﷺ ئالآیەکی سپی بۆدانان ، ئەم ئالآیەش درا دەستی عوبەیدە چونکە ئەمیری لە شکرەکە بوو ، لەپێشەوەی سوپاکە دەرۆیشت .

لەبەر ئەوە ئەو ئالآیەی درا دەست عوبەیدە ، یەکەم ئالآ بوو بۆ یەکەم جار لە ئیسلام درا بە عوبەیدە ، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێدا بە رۆیشتن بۆ (بطن رابغ) لێرەدا بۆ یەکەمین جار ، شەڕ لە نێوان موسلّمانان وگاوران کرا ، هەروەها ژمارەی گاورەکان لێرەدا دووسەد کەس بوون ، لەسەرەوەی هەموویان (ابو سوفیانی کوڕی حەرب) بوو کە هەتا ئێستا موسلّمان نەبوو بوو ، لەگەلّ ئەوەش عوبەیدە و سوپاکەی تووشی بەلآیەکی زۆر بوون لە پێناوی خوای گەورە .

ئەوە بوو هەردوو لەشکر لەشکری ئیمان وکوفر بەیەک گەیشتن لە شوێنێکی ناوی ناوی (الاحیاء) بوو کە شوێنێک بوو کەوتبووە جەرگەی (بطن رابغ) ، ئەوە بوو لە دوورەوە تیریان لەیەک گرت ، بەبێ ئەوەی بە شمشێر بە یەک بگەن .

لەم سریەدا چەند کەسێک لەریزەکانی کوفر هەلآتن بۆ ناو موسلّمانان :ـ لەوانە میقداد کوڕی عەمری کوڕی بەهرانی و ، عوتبەی کوڕی غەزوانی مازنی ، ئەوانە موسلّمان بوون بەلآم نەیان دەتوانی بگەن بە پێغەمبەری خوا ﷺ لەم کاتانەدا هەلّیان بۆ رەخساو گەیشتن بە موسلّمانان .

پاشان جەنگی بەدر هاتە پێش ، جەنگی بەدری گەورە کەوا شیعاری موسلّمانان : احد ، احد .. بوو ، ئەوەش دروشمێکی ناوخۆیی تایبەت بوو بۆ ناسینەوەو جوێ کردنەوە بوو ، دروشمی کۆچکەرەکان: ئەی نەوەی عبدالرحمن بوو ، وە دروشمی خەزرەجیەکان: ئەی نەوەی عبدالله بوو ، وەدروشمی ئەوسیەکان: ئەی نەوەی

عبیداللە بوو ، وپێغەمبەریش ﷺ ناوی لەم ئەسپەی ناو جەنگ نابوو: (ئەسپی خوا) وە زۆربەی داواکان ونزاکانی ئەوەبوو دەیگوت :- یا حی یا قیوم ، یا حی یا قیوم .

لەم جەنگەدا عوبەیدەی کوڕی حاریث یەکێک بوو لەپێشەنگە یەکەمەکان ، کەوا ڕوویەروو بۆوە لەگەڵ گاورەکان لەسەرەتای دەست پێکردنی جەنگەکە .

لەوکاتەدا سێ ملهوڕە گاورەکە هاتنە دەرەوە داوای هاوشانی خۆیان کرد بۆ جەنگی بەرامبەری ئەم سێ ملهوڕەش (عوتبەی کوری ربیع و کوڕەکەی کەناوی وەلیدی کوڕی عوتبەو شەیبە) بوون ، ئەوە بوو سێ مەدینەیان بۆ هاتنە دەرەوە ، بەلاّم داوای ئەم سێ ملهوڕە ئەوەبوو سێ کەس لەخزمەکانی بۆیان بێنە دەرەوە ئەوە بوو پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا فەرمووی : هەڵسە ئەی عوبەیدەی کوڕی حاریث هەڵسە ئەی حەمزە ، هەڵسە ئەی عەلی ، ئەوانیش ئەم سێ پاڵەوانە برواداره داوای ئەو سێ بێ باوەڕەیان کرد کەوا ڕازی نەبوون مەدینەییەکان بۆیان بێنە دەرەوە ، حەمزە وعەلی هەر بەزووترین کاتێ بە شمشێر عوتبە و کوڕەکەیان شاد کرد بە دۆزەخ ، بەلاّم عوبەیدە لەگەڵ شەیبەی بێ باوەڕ یەکتریان کلۆڵ کردبوو ، ئەوە بوو حەمزەو عەلی خۆیان گەیاندێ وشەیبەیان تەواو کرد .

عەلی وحەمزە بەکۆڵ عوبەیدەیان لەناو گۆڕەپانی جەنگ هەڵگرت و بردیانەوە ناوپۆلی موسڵمانان لای پێغەمبەری خوا ﷺ ، عوبەیدە شمشێرێکی بەقاچی کەوتبوو قاچەکەی لە چۆکیەوە لەدەست دابوو لێی بوو بۆوە ، مۆخ لەناو ئێسکی پێی دەهاتە دەرەوە .

عوبەیدەیان درێژکرد لای پێغەمبەری خوا ﷺ ، عوبەیدە لەنێوان ژیان و مردن دابوو ، پێغەمبەر ﷺ پێی خۆی درێژ کردو عوبەیدەش ڕوومەتی خۆی لەسەر کۆشی پیرۆزی پێغەمبەر دانا ﷺ ، تا لەم کاتی ئێش وئازارەدا عوبەیدە هەستی بەخۆشی وئارامی کرد ، پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد گووتی: شەهیدم ئەی پێغەمبەری خوا ؟ پێغەمبەر ﷺ وەلاّمی داوە فەرمووی : اشهد انک شهید .
واتە : شایەدی دەدەم کە تۆ شەهیدی .

لەئەنجامی ئەم ڕوو بەڕوو بوونەوەی کوفرو ئیمان خوای گەورەی لە سورەتی حەج ئایەتی دەرهەقیان هێنا خوارەوە کە دەفەرموێت :
(هذان خصمان اختصموا في ربهم فالذين كفروا قطعت لهم ثياب من نار يصب من فوق رؤوسهم الحميم ، يصهر به ما في بطونهم والجلود ، ولهم مقامع من

حديد ، كلما ارادوا ان يخرجوا منها من غم اعيدوا فيها وذوقوا عذاب الحريق ، ان الله يدخل الذين امنوا وعملوا الصالحات جنات تجرى من تحتها الانهار يحلون فيها من اساور من ذهب ولؤلؤا ولباسهم فيها حرير ، وهدوا الى الطيب من القول وهدوا الى صراط الحميد) .

عوبەیدە کاتێ دەبینی قاچێکی لەدەست داوە شانازی دەکا کەوا لەپێناوی خوای گەورە ئەم قاچەی لەدەست داوە ، داوای پاداشت لەخوای گەورە دەکات و داوای بەهەشت دەکا ، هەروەک لەم پارچە شیعرەی بەدیار دەکەوێ :-

فان تقطعوا رجلي فانى مسلم ارجي بها عيشا من الله دانيا
مع الحور امثال التماثيل اخلصت مع الجنة العلياء من كان عاليا
وبعت بها عيشا تعرق صفوه وعالجته حتى فقدت الادانيا
فاكرمني الرحمن من فضل منه بثوب من الاسلام غطى المساويا

پاشان موسڵمانە موجاهیدەکان عوبەیدەی کوڕی حاریثیان هەڵگرت و بردیانەوە بۆ مەدینە ، بەڵام عوبەیدە گیانی پاکی لەرێگادا تەسلیم بە خوا کرد ، لە شوێنێک کە پێی دەڵێن (صفراء) .

دۆڵی (صفراء) ناوی گوندێکە لە نزیک شاری مەدینە ، پڕە لە دارخورماو خێرو بەرەکەت . . . سەر رێگای حاجیانە ، پێغەمبەر ﷺ چەند جار بەم رێگایەدا رۆیشتووە دووری نێوان بەدرو ئەم شوێنە قۆناغێکە ، عوبەیدەی کوڕی حاریثیان لەم شوێنە ناشت ، پێغەمبەر ﷺ دووبارە اصحابەکانی دڵنیا کردەوە لە شەهادەتی عوبەیدەی کوڕی حارث ، بەدەست ئاماژەی بۆ دەکردو دەیگوت :- (اشهد انک شهید) .

سیرەی پیرۆز وادەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ رۆژێک بە ناوچەی (صفراء) تێپەڕی لە گەڵ هاوڕێیەکانی ، هاوڕێیەکانی پێغەمبەر ﷺ بە سەرسوڕمانەوە گووتیان : ئێمە بۆنی میسک دەکەین !!

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی چۆن بۆنی میسک ناکەن، ئەوە قەبری باوکی معاویە (واتە عوبەیدەی کوڕی حاریث) لێرەیە .

جێگای سەرسوڕمان نیە کەوا شەهید بۆنی میسکی لێ بێت ، چونکە لە زۆر فەرموودە پێغەمبەر ﷺ ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کەوا خوێنی شەهید یان بریندار بوون لە رێگای خوای گەورە بۆنی خوێنەکە بۆنی میسکی لێ بێت.

هەروەها لە فەرموودەكانی پێغەمبەر ﷺ گەورەیی شەهید وپلەی بەرزی لە بەهەشت ڕوون دەكاتەوە ، كەوا شەفاعەت بۆ حەفتا گوناهبار لە خزم وهاوڕێیەكانی خۆی بكات و لەیەكەم كاتی گیان دەرچوونی شوێنی خۆی لە بەهەشت دەبینی و وەلە سزای ناو گۆڕ ڕزگاری دەبێت و لە ناڕەحەتی گەورەی قیامەت دڵنیابەو هەروەها تاجی شەهادەتی لەسەر دەكرێ یەكسەر دەگا بە پەریەكانی بەهەشت .

بە ڕاستی ئەو ڕێزو گەورەیی یەی درایە بە شەهید نەدراْیە بە هیچ بە ندەیەك لەبەندەكانی .... لە خوای گەورە دەپاڕێینەوە پلەی شەهادەتمان پێ ببەخشێ وحەشرمان بكات لەگەڵ پێغەمبەرەكان وشەهیدەكان و خۆشەویستەكانی .. بمان گێڕێت بە سەربازی ڕاستەقینەی ئیسلام .

٦

# جەعفەری کوڕی ابی طالب

## شێوەو ڕەوشتی بە
## پێغەمبەری خوا دەچوو

﴿٦﴾

# جەعفەری کوڕی ابی طالب

## شێوەو ڕەوشتی بە پێغەمبەری خوا دەچوو

تاکو بڵێیت گەنجێکی جوان بوو ، ڕەنگی پێستی بەرەونەق بوو ، لە پێغەمبەری خوا دەچوو ﷺ ، بە لەسبەرەخۆیی و نەرم و نیانی وچاکە خوازی و مل کە چی بۆ خواو تەقوایەکی زۆر بەناوبانگ بوو ....

پیاوێکی ئەوەندە ئازابوو نەیدەزانی ترس چی یە ، ئەوەندە سەخی بوو بەهیچ جۆرێک نەدەترسا لە هەژاری ..... هە تاکو بڵێیت داوێن پاک وبە عیزەت بوو ..... لەدەس پاکی و ڕاستگۆیی هاوشانی نەبوو .....

هەموو دیەنێکی چاکە خوازی لی یەدی دەکرا .... چ لە ڕەوشت بەرزی چ لە گەورەیی ، ئەمەش جێگای سەر سوڕمان نیە ، کەوا لە هەموو کەس زیاتر بە پێغەمبەری خوا ﷺ دەچوو لە شێوە و ڕەوشت .....

ئێستا ئێمە لە بەرامبەر (باوکی هەژارانین) کەوا پێغەمبەر ﷺ ناوی لی ناوە ...

ئێستا ئێمە لە بەرامبەر (خاوەن دوباڵین) دووبارە پێغەمبەر ﷺ ناوی لی ناوە ..

بەڵێ ئێستا دەچینە خزمەت پیاوێک (باڵندەی بەهەشت)ی پێ دەڵێن ...

ئەویش (جەعفەری کوڕی ابی طالب)ە (خوا لی ی رازی بێت) یەکێکە لەو گەورە پیاوانەی سەرەتای ئیسلام ، کەوا بە باشترین بەشداری ، بەشداری کرد لە دارشتنی ژیانێکی بەختەوەری و سەربەرزی ....!! بە مسوڵمانەتی گەیشتە پێغەمبەری خوا ﷺ، جێگایەکی بەرزی گرت لە نێوان مسوڵمانە تازەکان .....

لە هەمان ڕۆژ خێزانەکەی بووە مسوڵمان کەناوی (اسماء بنت عمیس) بوو ..

هەردووکیان تووشی ئازارێکی زۆر بوون لەلایەن قورەیشەوە .... کاتێک صەحابیەکانی هەڵبژارد بۆ کۆچ کردنیان بۆ حەبەشە ، (جعفر) و خێزانەکەی هەڵبژاردران بۆ ئەم کۆچە ، هەروەها (جعفر) بوو بە ئەمیری کۆچکەرەکان و چەند ساڵێک لە حەبەشە مانەوە ، لەم ماوەیەدا خوای گەورە سێ منداڵی پێ بەخشی کەناویان ـ محمد وعبدالله و عەوف بوون .........

لە حەبەشە (جەعفەری کوڕی ابی طالب) قسەکەرو زمان پاڵاویان بوو ، خوای گەورە سەرکەوتووی کرد بە ناوی ئیسلام و پێغەمبەرەکەی ......

خوای گەورە چەند نیعمەتێکی بەخشی بوو بە جەعفەر وەک و دڵێکی پرشنگدارو عەقڵێکی فرەوان و ، زیرەکی و ، زمـان پـاڵاوی ..... ئەگەر هاتوو ڕۆژی (موئتـە) کەوا شەڕی تێداکردو شەهید بوو ... گەورەترین ڕۆژو ئەمرترین کاتی بێت ....
ڕۆژی (گفتوگۆ) کەشی کەوا لەبەرامبەر ئەجاشی حەبەشی بوو ، کەمترو بچوکتر نەبوو ، لەو ڕۆژەی کەوا تێیـدا شـەهید بـوو ..... بەڕاستی ڕۆژێکی پیرۆزو زێڕیـن بـوو لـە مێژووی ئیسلام.
قوڕەیشیەکان ئەم ڕقـە وکینـەیان لـەدڵ لانـەچوو وحیقدیـان بەرامبـەر ئیسـلام دانەمرکایەوە بەڵکو دەیانویست ئەم بانگە پیرۆزە بەتەواوی بسڕنەوە ، ئەوەبوو بە کـۆچ کردنی موسڵمانان بۆحەبەشە دڵیان دانەکـەوت ، بـەڵکو لەوەترسـان زیـاتر بـەهێز بن و پەرەبسێنن بۆ ئەوەی ئەم هێزو زۆریەیان بۆ مەیسەر نەبێت ، بڕیاریان دا ڕزگاریان بێت لـەم کۆمەڵـەو هـەتازووە ئـەم هەلـەیان لەدەست نـەچێت ، هـەروەها ئـەم کـۆچ کردنـەش هیوایەکی گەورەی پێغەمبەری خوابوو بۆ ئەوەی ئیسلام لەنوێوە جۆش بدات .
ئـەوەبوو گـەورە پیاوانیان بڕیاریـان دا چـەند نـێردراوێکی خۆیـان بنـێرن بـۆ لای ئەجاشی ، لەگەڵ کۆمەڵێک دیاریەبەنرخ ، بۆ ئەوەی ئەجاشی تکاکەیان قبوڵ بکـات ، بۆ دەرکردنی ئەوانەی کە پەنایان بۆ هێنـابوو ... ئـەم دوو نـێردراوەش :عبداللـە کـوڕی أبی ربیعەو عەمری کوڕی عاص بوو ، کە ئەوکاتە مسوڵمان نەبوو بوون.
ئەجاشی کاتی خۆی کەوا لەسەر عەرشی حەبەشە دانیشتبوو ، پیاوێکی خاوەن باوەڕی بەهێز بوو ، ئەمەش بە بڕیاری خۆی ئاینی مەسیحی بە پـاکی وەرگرتبـوو ، دوور لـە ڕێ دەرچوون و تە عەصوب .
لەبـەر ئـەوە ، پێغەمبـەر ﷺ وولاتـی حەبەشـەی هـەڵبژارد بـۆ کـۆچ کردنـی ئەصحابەکانی ، بۆ ئەم مەبەستە ، قوڕەیشەکان ترسان لەوەی کە دەیانەوێ نەیێتە جێ ، چەند دیاریەکی بە نرخیان دا بە نێردراوەکانیان بۆ ئەوەی بیـدەن بـە قەشـەکان وگەورە پیـاوانی کەنیسـە ، وە بـە نـێردراوە قورەیشیەکانیان گـووت : یەکـەم جـار ئەچنـە لای ئەجاشی هەتاکو دیاریەکان دەدەنە قەشەکان ، بۆئـەوەی قەناعـەتیان پێ بهێنن و ببنە پاڵپشتیان لای ئەجاشی .
دوو نـێردراوە قوڕەیشیەکە بارەکـەی خۆیـان خسـت و گەیشـتنە حەبەشـە ، گـەورە ڕۆحانیـەکانیان پێشـوازیان کـردن و دیاریـەکانیان لـی وەرگرتـن و ..... پاشـان دیاریەکانی (ئەجاشی) یان گەیاند .

لەم کاتانەدا دڵی قەشەو گەورە پیاوەکانی کەنیسەیان پڕکرد لە حیقدو دوژمنایەتی دژی مسوڵمانە کۆچ کردووەکان ، بۆ ئەوەی وابکەن نەجاشی دەریان بکات لە وولاتەکەی .

ئەم ڕۆژەشیان دیاری کرد بۆ ئەوەی دیداری نەجاشی بکەن ، هەروەها ناکۆکەکانیشیان کە مسوڵمانە کۆچ کردووەکان بوون ئامادەبن لەم ڕۆژەدا .

نەجاشی دانیشت لەسەر کورسی یە بەرزەکەی ، بە ویقارو رووناکی گەشەوە ،قەشەکان وپیاوە گەورەکانیان لەدەوری نەجاشی کۆبوونەوەو ، لە بەرامبەرو لەناو دیوانە ڕازاوەو فرمانەکەی پاشادا مسوڵمانە کۆچ کردوەکان دانیشتن ، دوو نێردراوە قورەیشیەکان بەرامبەر نەجاشی ڕاوەستا بوون تاوەتاوە مسوڵمانە کۆچکردووەکانیان تاوانبار دەکردو ، دەیان گوت : (ئەی پاشا ، چەند گەنجێکی هەرزەکاری بێ هۆش هاتوونەتە لات ، وازیان لە ئایینی میللەتەکەیان هێناوە ، هەتا نەهاتوونەتە ناو ئاینەکەی تۆش ، بەڵکو ئاینێکی نوێیان هێناوە ، نە ئێمە ونە ئێوە دەیزانن ، میللەتەکەمان ئێمەیان ڕەوانەی لای ئێوە کردووە بۆ ئەوەی ڕەوانەیان بکەنەوە

نەجاشی رووکردە مسوڵمانەکان و ، وپرسیاری لێ کردن :

(ئەو ئایینە چی یە کەوا ئێوەی جودا کردۆتەوە لە میللەتەکەتان ، وە لە ئایینی ئێمەش بێ منەتن و بە گەورەتری دەزانن ؟) .

(جعفر) هەڵسایەوەو بە هێمنی و لەسەرەخۆیی یەوە گووتی :

[ ئەی پادشا ..... ئێمە میللەتێک بووین کاتی خۆی نەفام بووین دارو بەردمان دەپەرست ، گۆشتی مردوومان دەخوارد ، داوێن پیسیمان دەکرد ، هاموشۆی یەکترمان نەدەکرد ، لەگەڵ دراوسێمان خراپ بووین ، بەهێزمان بێ هێزی دەخوارد ، تاکو خوای گەورە پێغەمبەرێکی لە خۆمان بۆ ڕەوانە کردووین ، بنەماڵەی دەناسین ، بەڕاستگۆیی و دەست پاکی و ڕەوشت بەرزی بەناوبانگە لە ناومان ، بانگی کردوین بۆ یەکتا پەرستی خواگەورە و وازهێنین لە پەرستنی بەرد وبت کە ئێمە وباپیرانمان دەمان پەرست ... )

(وەفەرمانی پێ کردووین بە ڕاستگۆیی و بە جێهێنانی ڕاسپاردەو ، وەهاموشۆی خزمان وچاکە لەگەڵ دراوسێ و دەست هەڵگرتن لەشتی حەرام ویەکتر کوشتن) و قەدەغەی کردووین لە داوێن پیسی وسوێندی بە درۆو ،خواردنی ماڵی هەتیوو ، وە بوختان بە ئافرەتی مسوڵمان ...... ئێمەش بە ڕاستمان دانا و بڕوایمان پێ هێنا ...

وه بەدوای ئەوه کەوتووین کە خوا بۆی ناردووه ، خوای تاکمان پەرست و هاوبەشمان بۆ پەیدا نەکرد ، ئەوەی بۆی حەرام کردووین بە حەرامان دانا ، ئەوەی بۆشی حەلال کردووین بە حەلالمان دانا ، ئازاریان داین بۆ ئەوەی پەشیمانمان بکەنەوه لەسەر ئەم ئایینە ، بۆئەوەی بمان گێڕنەوه بۆ پەرستنی بت ، وه ئەو شتە پیسانەی کە لەسەرینە) .

(کاتێک ناچاریان کردووین بەزەویان دادایین ، وه ستەمیان لی کردووین و ، شوێنیان پێ تەنگ کردووین ، وه بەربەستیان هاویشتە نیوان ئێمەو ئایینەکەمان ، هاتینە ولاتی تۆو وامان پێ باش بوو پەنات بۆ ببەین ، تکامان ئەوه بوو ستەممان لێ نەکرێ لەلای تۆ] .

هەروەک ڕۆژی پرشنگدار (جعفر) ئەم ووشانەی دەربڕی ، دڵ و دەروونی نەجاشی لەگەڵ لەرزاند ، ڕووی کردە (جعفر) و پرسیاری لی کرد :

(ئایا چ دەزانی لەوەی بۆ پێغەمبەرەکەتان هاتۆتە خوارەوه) ... ؟؟

جعفر گووتی ! بەڵێ ......

نەجاشی پێ گووت :. بۆم بخوێنەوه .....

(جعفر) دەستی کرد بە خوێندنەوەی چەند ئایەتێک لە سورەتی مریم ، بە خوێندنەوەیەکی خۆش و شیرین و مل کەچی یەکی سەرنج ڕاکێشەر .... نەجاشی دەستی بەگریان کرد ......... هەموو قەشەکانیش لەگەڵی گریان فرمێسکی چاوی وەک باران دەباری و دەهاتە خوارەوه کاتێ تەواو بوو ، ڕووی کردە نوێنەرەکانی قورەیش و ، پێی گووتن : [ئەمەی ئەوانەدەیلێن ، ئەوەی بۆ عیسا هاتووه ، لەیەک دەلاقبە هاتوونەتە خوارەوه ...... بڕۆن .... والله .... ئاتان دەمەوه دەست]

کۆمەلەکە ڕۆیشتن و ، خوای گەوره بەندەکانی خۆی سەرخست وپشتی گرتن :

نوێنەرانی قورەیش تووشی شکستێکی بێ ئەندازه بوون بەلام (عەمری کوڕی عاص) پیاوێکی زۆر فێڵباز بوو ، شکستی وورەی بەرنەداو ، گوێ نەدا بەم شکستی یە .....

بەم جۆرە کاتێکی کەمی نەبرد لەگەڵ هاوڕێ کەی گەڕاوه شوێنی خۆیان و ، بیری کردەوەو پیلانی دانا ، بە هاوڕێیەکەی خۆی گووت :.

[والله ، بەیانی دەچمەوه لای نەجاشی ، دەبێ وا بکەم ڕەگ وریشەیان دەربهێنم] .

هاوڕێیەکەی وەلامی دایەوه و گووتی : (ئەوەی مەکە ، ئەوانە خزمی ئێمەن ، ئەگەر بەگوێشمان نەکەن) .

عەمر گووتی :ـ (دەچم دەڵێم ئەوانە دەڵێن عیسای کوڕی مەریەم بەندەیە ، هەروەکو بەندەکانی تر) .

ئەوش پیلانێکی نوێ بوو ، نوێنەرانی قورەیش دروستیان کرد بۆ ئەوی وابکەن مسوڵمانان دەستە وەستان بوەستن و نەتوانن وەڵامی ئەم پرسیارە بدەنەوەو ، بیان هاوێنە نێوان دوو بەردەئاش ، ئەگەر بڵێن: (عیسا بەندەکە لەبەندەکانی خوا ، ئەوا قەشەکان و پاشا دژیان هان دەدەین و تووڕەیان دەکەین ئەگەر بشڵێنن عیسا بەشەر نەبووە ، ئەوا لە ئایینەکەی خۆیان دەرچووینە !!) .

بۆ بەیانی چووە دیداری پاشا ، عەمر بە نەجاشی گووت :

(ئەی پاشا ، ئەوانە قسەکی مەزن ددکەن لەسەر عیسا ) .

قەشەکان هەموو دەستیانکرد بە پسەپس وشێوان ....

ئەم عیبارە کورتە ئەوانی هەژاندەوە ..

دیسان بانگی مسوڵمانانیان کردەوە بۆ جارێکی تر. پرسیاریان لێکردن هەڵوێستیان دەربارەی مەسیح) .

پاشان ڕێک کەوتن لەسەر ئەوەی ڕاستی بڵێن لەوەی گوێیان لێ بووە لە پێغەمبەرەکەیان ﷺ ، هەتا یەک موو لی ی لانەدەن ، چ دەبێ با ببێ ...!!

دیسان کۆنگرە بەستراوە سەر لە نوێ ، نەجاشی لە سەرەتای قسەدا پرسیاری لە (جعفر) کرد :

[چی دەڵێن دەربارەی عیسا ...؟؟

جارێکی تر (جعفر) هەروەک مانگێکی پرشنگدار هەڵساوەو ، گووتی :ـ

[ئەوەی دەیڵێن دەربارەی، کە بۆ پێغەمبەرەکەمان هاتووە ﷺ :عیسا بەندەی خواو پێغەمبەریەتی ، وەبە ووشەی (ببە) خوای گەورە عیسای دروست کرد و ، وە ڕۆحەکی پێ بەخشرا لەلایەن خوداوە] .

نەجاشی هاواری کردو دانی بەڕاستیەکەی هێنان و ، ئەوەی ئەو گووتی ، مەسیحیش ئەوەی گوتووە لەسەرە خۆی .... بەڵام ڕیزەکانی قەشەکان ناڕازیان دەرکەوت ....

نەجاشی وەکو بڕواداڕێکی ڕۆناکبیر لە قسەکانی بەردەوام بوو بەرامبەر مسوڵمانان :

[بڕۆن ، ئێوە ئەمینن لە خاکی ئێمە ، هەرکەسێک قسەتان پێ بڵێ و نازارتان بدات ، ئەوا لە سەریەتی تۆڵەتان بدات بەوەی کردوویەتی] .

پاشان ڕووی کردە نوێنەرەکانی قوڕەیش وپەنجەی لیّ بڵند کردن و گووتی :-
(واللە ، خوای گەورە داوای بەرتیلی لەمن نەکرد ئەو کاتەی مولکی دامەوە ، تاکو بەرتیل لەم ڕێگایە بدریّ ..] !!
نوێنەرانی قوڕەیش بەسەر شۆڕی ڕوویان لە مەککە کردەوەو گەڕانەوە ....
مسوڵمانان مانەوە بە سەرۆکایەتی (جعفر) بە ژیانێکی خۆش ، هەروەک خۆیان گووتەنی :-
(باشترین شوێن ... لەگەڵ باشترین دراوسیّ) تاکو خوای گەورە ڕێگای پیّ دان بە گەڕانەوەیان بۆ لای پێغەمبەرەکەیان وبرایان و وولاٚتیان ....
پێغەمبەری خوا و مسوڵمانان ﷺ دڵخۆش بوون بەئازاد کردنی (خەیبەر) لەوکاتەدا جعفر کوڕی ابی طالب بەدیار کەوت و دەگەڕاوە لە حەبەشە هەروەها هاوڕیّ یەکانیشی لەگەڵ دابوون.
دڵی پێغەمبەر ﷺ پڕبوو لە خۆشی وبەختەوەری ومزگێنی ، ئەوە بوو پێغەمبەر ﷺ باوشی لیّداو ، گووتی:
[نازانم بەکامیان کەیف خۆش بم : بەئازاد کردنی خەیبەر ..... یان بە گەڕانەوەی جەعفەر] !!
پێغەمبەرو صەحابیەکان سوار بوون ڕۆیشتن بۆ مەککە ، لەو کاتە دا قەزای عومرەیان دەکردەوە ..... وەگەڕانەوە بۆ مەدینە ، بەڕاستی دڵ و دەروونی (جعفر) گڕی گرت بەوەی گوێی لی بوو دەربارەی برا بڕوا دارەکانی کە ئەوەی بەسەریان هات لە گەڵ پێغەمبەر ﷺ لە جەنگی بەدرو ئوحد .... هەروەها جەنگەکانی تر ..... چاوەکانی پڕ بوو لە گریان بۆ ئەوانەی گیانی خۆیان بەخشی لە پێناوی خواو شەهید بوون ..... دڵی باڵی گرت بۆ بەهەشت ، بۆ وەدەست هێنانی هەلێک بۆ ئەوەی شەهید بێت ، چاوەڕوانی ئەم ساتە پیرۆزەی دەکرد ..... هەروەها جەنگی (موئتە) کە باسمان کرد ، ئالای دەهەژاوە و ئامادە بوو بۆ ڕۆیشتن و ، ڕیّ پێوان ....
لەم جەنگەدا جەعفەر وای تێدا ڕادەبینی کەوا هەلێکی ژیانیەتی ، یاخود سەرکەوتن بەدی دەهێنێت بۆ ئایینی خوا ، یاخود بگات بە شەهادەتێکی مەزن لە ڕێگای خوا ...
چووە لای پێغەمبەری خوا ﷺ تکای ئەوە بوو ، لەم جەنگەدا جێگایەکی هەبێت ، جەعفەر دەیزانی بە تەواوی کەوا ئەمە کەیف و بەزم نیە .... جەنگێکە لەگەڵ لەشکری ئیمپڕیا توریەتی بەهێزی ڕۆم ، کەوا خاوەن چەک و سەربازی و سامانێکی

وایه ، نه عەرەب و نه مسولمانان نەیان دیوه ، له گەڵ ئەمەشدا (جعفر) دلی بۆی فڕی بوو ، یەکێک بوو لە سێ سەرکردەکانی ئەم جەنگه ....

سوپاکه بەڕێ کەوت و ، ئیمامی جەعفەریش دەرچوو لە گەڵیان ... هەقی خۆی بوو (جعفر) ترس بیگرێ کاتێ بینیبای لەشکری ڕۆم ژمارەی خۆی لە دووسەد هەزار کەس دەدا ، بەڵام بەپێچەوانەو هەست و نەستێکی بەهێزی لە دڵدا دروست بوو بە هۆی ئەو غیرەتە بڕواداریەی هەیبوو ، قارەمانێکی وەها خۆی ئامادەکرد بوو ، کەشەڕ لەگەڵ هاوشانانی خۆی بکات .

کاتێکی زۆری نەبرد ئالآ لە دەستی (زەیدی کوری حاریثه) کەوتە خوارەوەو ، (جعفر) بەدەستی ڕاستی وەری گرتەوە .... شەڕی پێ کرد بە هێزو توانایەکی بێ ڕادەو ، خۆڕاگرتنێکی بێ وێنە ئەوە بوو سەربازێکی زۆر دەورەیان لە (جعفر) دا.

جەعفەر کەوتە ناوەڕاستی ڕیزی ڕۆمەکان ئەوانیش وەکو لێشاو بۆی هاتن ، (جعفر) هاواری کردو دەنگی دەداوەو دەیگووت :

یــاحبــذا الجنــة واقترابها طيبة ، وباردا شرابها

والروم روم ، قد دنا عذابها كافرة بعيدة انسابها

علي اذ لاقيتها ضرابها

ڕۆمەکان زانیان لەبەر توانای ئەم پیاوە چۆن شەڕکەرێکه ، وەکو لەشکرێکی هێرشکەر دەورەیان دا بە شێتانە لەهەموو لایەکەوە ، دەورەیەکی وایان دا ڕێگای ڕزگاربوونی نەبوو . بە شمشێر لە دەستی ڕاستیان دا ، پێش ئەوەی ئالآکه لەدەستی بکەوێتە خوارەوە ، بەدەستی چەپ وەریگرتەوە ، لەو دەستیشیان دا بە باسکی ئالآکەی گرتەوە ......

لەم ساتانەدا وای تەماشا دەکرد بە لێپرسینەوەوە ، چۆن دەبێ ئالآی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆزاوی بێ و ئەویش زیندوو بێت .... کاتێک لاشەی پیرۆزی لەسەر زەوی بوو ، ئالآکه لە نێوان باسکی چەقیبوو دەشەکایەوە ئەوەبوو (عبدالله کوڕی ڕەواحه) ڕیزەکانی دوژمنی بڕی وەک و بروسک ، ئالآکەی هەڵگرت وبڵندی کرد .....

بەم جۆرە (جعفر) مردنێکی وای دروست کرد ، کەوا گەورەترین مردنی بەشەر بوو !! بەم جۆرە گەیشتە بارەگای خوای خۆی ، ناوبانگی خۆبەفیداکردنەکی دەنگی دایەوە ، بەهۆی ئەو قارەمانیەتەی کە نواندی لە بەرەکانی جەنگدا .....

خوای گەورە دەنگ وباسی ئەم شەڕەی دەدا بە پێغەمبەرو یەک یەک دەیانبینێ چۆن هەرسێ فەرماندەکە شەهید دەکرێن و شمشێری خودا درا بە (خالیدی کوڕی وەلید) بەم جۆرە لە شکری ڕۆمەکان تەفرو تونا بوون ... بەڵام شەهید بوونی (جعفر) کاری لە پێغەمبەر ﷺ کردو ماڵ ئاوایی لە (جعفر) کردو فرمێسکی خۆشەویستی بۆ هەڵڕشت ...

یەکسەر چووە ماڵی کوڕەمامی ، بینی خێزانەکەی (جعفر) هەرسێ کوڕە شیرینەکەی عبداللە ومحمد وعوف خاوێن دەکاتەوە و بۆنیان لی‌دەدا .... بانگی منداڵەکانی کردو تێرتێر بۆنی‌کردن وماچی کردن و فرمێسکی وەک کانی لە چاو دەهاتە خوارەوە ...

پاشان گەڕاوە ناو ئەصحابەکانی و ، ئەصحابەکان دەورەیان دابوو ، شاعیرانی ئیسلام (حسان بن ثابت) و (کعب کوڕی مالک) تێرو پڕ شیعری خۆشەویستیان بەسەر (جعفر) دا گووت ....

هەژارەکان هەر هەموویان بۆ باوکی هەژاران دەگریان ، بەڕاستی (ئیمامی جعفر) باوکی هەژاران بوو. ابو هریرە (خوا لی‌ی ڕازی بێت) دەفەرموێ: [باشترین کەس بۆ هەژاران ، جەعفەری کوڕی ابی طالب بوو] بەڵێ .... سەخی ترین کەس بوو بە ماڵ ئەو کاتەی زیندوو بوو ، کاتێ مردنیشی نزیک بۆوە بۆشەهادەت ، لە هەموو کەس زیاتر فیداکاری بە گیانی خۆی نواند ... عبداللە ی کوڕی عومەر دەڵێت :

[ئێمە لەگەڵ جعفر بووین لە جەنگی موئتە ، بەدوای دا گەڕاین ، کە دۆزیمانەوە بینیمان نۆهەد و هەندێک برینی ڕم وشمشێری بە لەشەوەیە] . لەگەڵ ئەم هەموو ئازارە ، سەلماندی کە پیاوی موجاهید و بڕوادار لە مردن ناترسێ ، بەڵکو تەمەنای مردن دەکات لەمەیدانی شەڕ بە پێیچەوانەی دوژمنانی خوا کە عاشقی ژیانن و لەبەر مردن هەڵدێن ....

بەڵێ .... شمشێرو ڕمەکانی بڕواداران دەبوونە پردێک بۆ ئەوەی پێیدا بپەڕنەوە بۆ گەیشتن بە خواو بەهەشتەکەی ، بەم جۆرە خوای گەورە (جعفری) لە بەرزترین شوێن دانا لە بە هەشت و .... مەدالیای جەنگ لە هەموو برینەکانی لەشی (جعفر) قایم کرا ....

ئەگەر حەز دەکەن کۆتایی بە ژیاننامەی ئەم هەڵۆ سپی یە بەهەشتی یە بێنین ، باگوێ بدەینە پێغەمبەری خوا ﷺ بزانین چ دەفەرمووێت ، دەربارەی (جعفر) : [لقد رأيته في الجنة ... له جناحان مضرجان بالدماء ، مصبوغ القوادم] .
واتە :ـ (بینیم ئیمامی جەعفەر لە بەهەشت ، خوای گەورە دوو باڵی سووری بۆ دروست کردبوو ، هەتا پێیەکانیشی سوور ببوون) .
دوا تکامان لە خوای گەورە ئەوەیە : زانست و ئازایەتی وفیداکاری وسەخاوت و خۆڕاگری و دڵسۆزی و زمان پاڵاوی و هەست وسۆزی ئیمامی جەعفەرمان پێ ببەخشێت ...
والحمد لله رب العالمين .

٧

# عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە

ئەی نەفسم ئەگەر
نەکوژرێی هەر دەمری

﴿٧﴾

# عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە

## ئەی نەفسم ئەگەر نەکوژرێی هەر دەمری

کاتێک پێغەمبەر ﷺ دانیشتبوو بە دزی گاورەکانی قوڕەیش لەگەڵ ئەو نێردراوەی کەلە شاری مەدینە هاتبوون لە دەروازەی شاری مەکە ، پەیمانی بەست لەگەڵ ئەو دوانزە پێشەنگەی یاریدەدەرەکان لە پەیمانی عەقەبەی یەکەم ، عبداللەی کوڕی ڕەواحە یەکێک بوو لەم پێشەنگانە ، ئیسلامی گەیاندە شاری مەدینە ، ئەو پەیمانە بوو ، بە بێشکەی ئەو کۆچەی کەوا تیشکی ئایینی خوای لی هەڵات ، کە ئیسلام بوو .... وە ئەو کاتەی پێغەمبەری خوا بۆ ساڵی دووەم پەیمانیدا بە حەفتاو سێ یاریدەدەری تر لە خەڵکی مەدینە لە پەیمانی عەقەبەی دووەم ، (کوڕی ڕەواحەی) بەڕێز یەکێک بوو لەم پێشەنگانە ..

وە پاش کۆچی پێغەمبەرو یاوەرەکانی بۆ شاری مەدینە وجێگیر بوونیان لی ی ، عبداللەی کوڕی ڕەواحە لە هەموو یاریدەدەرەکان زیاتر کاری کرد بۆ سەرکەوتنی ئەم ئاینەو چەسپاندنی کۆڵەگەکانی ، عبداللەی کوڕی ڕەواحە لەهەموو خەڵکەکە زیاتر ئاگای لە فرت و فێڵەکانی (عەبدولای کوڕی ابی) بوو ، کەوا پێش هاتنی پێغەمبەر بۆ مەدینە ، مەککەیی یەکان دەیانویست بیکەن بە پادشای شاری مەدینە ، ئەویش هێشتا تامی ئەو پاروە چەورەی لە قوڕگی مابوو ، بەم جۆرە فێڵەکانی خۆی دژی ئیسلام بەکار دەهێنا .....

لێرەدا عبداللەی کوڕی ڕەواحە بە چاوێکی تیژو ڕوناکبیر دەیڕوانیە فرت وفێڵەکانی (کوڕی ابی) زۆربەی پیلانەکانی بی پووچەڵ دەکردەوە ...

هەروەها (کوڕی ڕەواحە) خوا لی ڕازی بێت ، خوێندەوار بوو لە سەردەمی خۆی ، کەوا ئەو کاتە خوێندەوار زۆر کەم بوو .... شاعیرێک بوو ، شیعر لە نێوان لێوەکانیدا وەکو ئاو لە کانیدا هەڵدەقوڵا

هەر لەو کاتەی بووە مسوڵمان ، هۆنراوەکانی لە خزمەتی ئیسلام بەکار دەهێنا .. پێغەمبەر ﷺ زۆر حەزی لە هۆنراوەکانی دەکردو هانی دەدا ..

ڕۆژێک پێغەمبەر لە گەڵ ئەصحابەکانی دانیشتبوو ، عبداللەی کوری ڕەواحە ، هاتە لای پێغەمبەر لێی پرسی ﷺ : [چۆن شیعر دەڵێیت ، ئەگەر بتەوێ بیلێیت]..؟؟

عبدالله وەڵامی دایەوە : [تەماشای بابەتەکە دەکەم ئنجا دەیلێم] ...

ئنجا تەماشای پێغەمبەری خوای کردو ئەم شیعرەی گووت :

یا هاشم الخير ان الله فضلكم     على البرية فضلا ما له غير

اني تفرست فيك الخير اعرفه     فراسة خالفتهم في الذي نظروا

وە ئەو کاتەی پێغەمبەری خوا تەوافی ماڵی خوای دەکرد لە قەزای عەمرە ، کوڕی ڕەواحە ئەم شیعرانەی بە سروود دەگووت :

يارب لولا انت ما اهتدينا     ولا تصدقنا ولا صلينا

فانزلن سكينة علينا     وثبت الاقدام ان لاقينا

ان الذين قد بغوا علينا     اذا ارادوا فتنة ابينا

مسوڵمانان هەموو کات ئەم شیعرەیان دەگووتەوە ..

ئەم شاعیرە لە خوا ترسە ، خەمی خوارد کاتێک ئەم ئایەتە پیرۆزە هاتە خوارەوە :[والشعراء يتبعهم الغاوون] ...

بەڵام لەپاشان خۆشی دڵی خۆی داوە بەم ئایەتە : [الا الذين امنوا وعملوا الصالحات ، وذكروا الله كثيرا وانتصروا بعد ما ظلموا ..] کاتێک ئیسلام لە جەنگەکاندا بەرگری لە خۆی دەکرد ، (کوڕی ڕەواحە) شمشێرەکەی بڵند کرد بوو لە دیمەنەکانی (بەدرو ئوحدو خەندەق وحودەیبیەو وخەیبەر) ئەم دروشمەی بە هۆنراوە دەگووتەوە :

[ يانفس الا تقتلي تموتي]

واتە :ـ ئەی نەفس ئەگەر نە کوژرێی دەمری ..

کاتێک جەنگی (مؤتة) هاتە پێشەوە ...

عبدالله سێیەم ئەمیر بوو .... لەپاش زەید و جەعفەر ...

بەڵێ عبداللەش وەکو زەیدو جەعفەر هەموو هیواو ئاواتی ئەوەبوو ، کەوا شمشێرێک یان ڕمێکی پێ بکەوێت و بیگوازێتەوە بۆ جیهانی شەهیدە سەرکەوتووەکان ...

بەم جۆرە هەروەکو گووتمان لەشکر دابەزی بۆ موئتەو ، کاتێک مسولمانان تەماشای ریزەکانی دوژمنیان دەکرد بە دووسەد هەزار شەرکەر ، کەوا کۆتایی ریزەکانیان نەدەهات و نەیاندەتوانی حیسابی ژمارەیان بۆ بکەن . . .

تەماشای خۆشیان دەکرد بەم لەشکرە کەمە ، لەناو ئەوان بزر ببوون ، هەندێکیان بە یەکتریان دەگووت :ـ [بۆ پێغەمبەری خوا رەوانە بکەین ، خەبەری بدەینێ بە زۆری دوژمنەکانمان ، یان فەرمانمان پێ بکات بە پەلامار دانیان و ئێمەش گوێ رایەلی بکەین] .

لەم کاتانەدا (کوڕی رەواحە) هەلساوە لە ناویان ، وەکو رۆژ بە سەر تاریکیدا ، پێی گووتن : [ئەی خەلکینە . . ئێمە سوێند بەخوا ، شەڕ ناکەین لەگەلْ دوژمنانمان بە ژمارە ، وەنە بەهێزو ، وە نە بە زۆری . . . .شەڕیان لە گەلْ ناکەین تەنها بەم ئایینە نەبێت ، کەوا خوا رێزی لێ ناوین پێ ی . . بۆیان دەرچن . . . لەم دوو سەرکەوتنە زیاتر نیە . . . . . سەرکەوتن یان شەهیدی] . . . بەم جۆرە مسولمانە کەم ژمارەکان وئیمان بەرزەکان . . . . پێکەوە گووتیان وهاواریان کردن [سوێند بەخوا بەراستی ، کوڕی رەواحە راستی گووت] .

لەشکری ئیسلام گەیشتە مەبەستی خۆی و بەرەنگاری دوو سەد هەزار کەس بۆوە لە رۆمەکان کەوا شەڕێکی مەترسیدارو ترسێنەریان دەکرد . . . .

یەکەم ئەمیر زەید شەهید بوو . . . . دووەم ئەمیر ئالاکەی بەرز کردەوە (جعفر) یش شەهید بوو ، ئنجا عبدالله ئالاکەی لە دەست جەعفەر وەرگرت و کەوتنە ناو دوژمن چۆن لە ژێر دەریا بزربێت . . .کاتێک کوڕی رەواحە وەکو سەربازێک شەڕی دەکرد ، دەهات و دەچوو بەبێ دوو دلی و گرنگی دان .

بەلاّم ئێستاکە بووە ئەمیری لە شکری ئیسلام ولێپرسراوە لە ژیانیان ، ئەوە بوو یەکەم جار تۆزێک سام گرتی بەرامبەر ئەم هێزە گەورەی دوژمن ، بەلام لە کاتێکدا وورەی هاتەوە رووی لەم هێزە ترسناکە کردوو هاواری کرد :

| | |
|---|---|
| اقسمت يا نفس لتنزلنه | مالي اراك تكرهين الجنة ؟! |
| يا نفس الا تقتلي تموتي | هذا حمام الموت قد صليت |
| وما تمنت فقد اعطيت | ان تفعلي فعلهما هديت |

واتە زوو بگە بەم دوو شەهیدەی لە پێشەتۆ شەهید بوون کەوا زەیدو جەعفەر بوون بەم جۆرە وەکو لافاو رووی لە رۆمەکان کردو ، ئەگەر ئەو ئەجەلەی بۆی نوسرا بوو لە

بەر ئەو نەبووایە ، ڕۆمەکانی بە شمشێرەکەی قەلاچۆ دەکرد ، بەلاّم کاتی کۆچکردنی بوو ، بەهەشت وەکو زەنگ لی ی داو ڕێگای خوای گرت و شەهید بوو گەیشت بە هاوەڵە بەرێزەکانی وگەیشت بە هیواو ئاواتی خۆی .....

بەڵێ لەو کاتانەدا پێغەمبەر ﷺ لەناکاو قسەکانی خۆی بڕی و چاوەکانی هاوێشتە سەریەک و لە مانگە دەسکردەکانی خوادا لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن بینی و فەرمووی : [ زەیدی کوڕی حاریثە ئالاّکەی هەڵگرت ، شەڕی کرد تاکو شەهید بوو .

پاشان (جعفر) شەڕی پێکردو ، تاکو شەهید بوو ..

[ تۆزێک بیّ دەنگ بوو ، پاشان دووبارە گووتی :ـ عبداللەی کوڕی ڕەواحە ئالاّکەی هەڵگرت و شەڕی کرد تاکو شەهید بوو ... ] پاشان کەمێک بیّ دەنگ بوو ، ڕووی گەش بووە وکەیف خۆش بوو ، پاشان گووتی: [ بڵند کرانەوە بۆ بەهەشت و منیش دەیانگەمیّ . . ]

«٨»

# زەیدی کوڕی حاریثە

## خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ

پێغەمبەری خوا ﷺ وەستا بوو خوا حافیزی لە لەشکری ئیسلام دەکرد ، کەوا دەڕۆیشتن بۆ گەیشتن بە سوپای (ڕۆم) لە جەنگی موئتە ، هەروەها ناوی سێ ئەمیرەکانی لەشکرەکەی ئاشکرا کرد ، فەرمووی :

[ زەیدی کوڕی حاریثە ئەمیرتان دەبێ ، ئەگەر زەید لیٛدرا ، جەعفەری کوڕی ابی طالب ئەمیرتان دەبێ ، ئەگەر جەعفەریش لیٛدرا ـ عەبدولای کوڕی ڕەواحە ئەمیرتان دەبێ ]

...... ئایا دەبێ ئەم زەیدی کوڕی حاریثە یە کێ بێت ... ؟!

کێیە ئەوەی ، تەنها ئەو نازناوی (خۆشەویست) ...... خۆشەویستی پێغەمبەری خوای هەڵگرت .... ؟ بەڵام شێوەو ڕوخساری هەروەکی مێژوو نووسانی ئیسلام دەگێڕنەوە :

(پیاوێکی کورتە بالای ، ڕەشەسمەری ، لووت پانی ئەفنەس) .....

بەڵام باسکردنی ئەم پیاوە زۆر سەیرو مەزنە ... !!!

حاریثە باوکی (زەید) بارو پێویستیەکانی ئامادە دەکرد بۆ (سعدی) خێزانی ، کەوا دەیویست زیارەتی ماڵی باوکی بکات لە (ئەوەی مەعن) .....

چووە دەرەوە بۆ ماڵ ئاوایی کردن لە خێزانەکەی ، کەوا باوەشی کردبۆوە لە منداڵە بچوکەکەی (زەیدی کوڕی حاریثە) ، هەر کاتێک کاروانەکە دەیویست ماڵ ئاوایان لیٛبکات کەوا خێزانەکەی لەگەڵیان بوو ئەویش بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە ، سەرکارو کاسبی ، بەڵام سۆزی باوکاتی وای دەکرد ماوەیەک بەپێ لە گەڵیان بڕوات .....

بەڵام کاروانەکە ڕۆیشتنی خۆی وەرگرت ، وا دوور دەکەوێتەوە ، ئێستا کەش حاریثە خواحافیزی لە منداڵەکەو خێزانەکەی دەکات و ، ئەویش دەگەڕێتەوە .... بەڵێ بەم جۆرە حاریثە خوا حافیزی لیٛکردن و فرمێسکیش لە چاوەکانی گیرندەبوو ، ماوەیەکی زۆر لە شوێنی خۆی ڕاوەستا ، هەر لە دوورەوە تەماشای کاروانەکەی دەکرد ، تاکو لە پێش چاوی وون بوون ، وای هەست دەکرد دڵی لە شوێنی خۆی تەماوەو ، دەتگووت لەگەڵ کاروانەکە ڕۆیشتووە .....!! (سعدی) خێزانی حاریثە، ئەوەندەی حەزی کرد ماوە لەناو ئەتەوەکەی ... ڕۆژێک لە ڕۆژان لەناکاو بەسەر ناوچەکەیان دا

درا ، واته ناوچەی نەوەی (مەعن) بەهۆی یەکێک لە هۆزە هێرش بەرەکان کە دوژمن داریان هەبوو لە گەلیان و ، غارەیان لەسەر کردن ، بەم جۆرە شکستیان هێنا بە نەوەی (مەعن) ، لەو دیلانەی کەوا دیلیان کردبوون ئەم مێرد منداڵەیان لەگەڵ بوو کەوا (زەیدی کوڕی حاریثە) بوو ...
دایکی (زەید) بە تەنها گەڕاوە بۆلای مێردەکەی ...
هێشتان (حاریثە) دەنگ وباسی ئەم بەسەرهاتەی نەزانیبوو هەتا وای لیٚهات لەسەر چۆک کەوت ، گۆپاڵەکەی لەسەر شانی دادەنا و ، دەسوڕایەوە لە چۆڵ و بیابانەکان ، لە هۆزەکان و کاروانەکانی دەپرسی دەربارەی خۆشەویستی دڵی (زەید) ،بەم جۆرە دڵی خۆی دەدایەوەو حوشترەکەی بەپێشە خۆی دەداو ئەم هۆنراوەی دەگووت:

بکیت علی زید ولم ادر ما فعل    احي فيرجى؟ ام اتــى دونه الاجـل
فوالله ما ادري ، وانـي لسائـل    اغالك بعدي السهل ؟ ام غالك الجبل

بە کۆیلەکردن لەم سەردەمەدا ، خۆی چەسپاند بوو بەسەر ئەم کۆمەڵگایانە وەکو پێویستیەک ...لە (ئەثینا)ش ئەم پیشەیە بڵاوبووبۆوە ، لە کاتێک لەو پەڕی ئازادی وهەروەها لە (ڕۆما)ش ئەم پیشەیە بڵاوبیبۆوە ...... وە لەسەردەمە دێرینەکان بەتەواوی پەرەی سەندبوو ، هەروەها لە دورگەی عەرەبیش ....کاتێک هۆزی (المغيره) سەرکەوتنیان بەدەست هێنا بەسەر نەوەی (مەعن) .... دیلەکانیان لەگەڵ خۆیان هێنا بۆبازاڕی (عکاظ) کەوا کاتی بەستانی هاتبوو ، دیلەکانیان فرۆشتەوە ..... ئەم مێردمنداڵە واتە (زەید) کەوتە بەر دەستی (حکیم کوڕی حزام) کڕی وپاشان بە دیاری دایە (خدیجە) ی پلکی ....
ئەو کاتە (خدیجە) ببووە خێزانی محمد کوڕی عبدالله ﷺ ، کەوا هێشتان نیگای بۆنەهاتبوو ، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا هەموو سیفاتێکی بەرزی هەڵگرتبوو ، بۆ ئەوەی بەیانی شایانی پێغەمبەرایەتی بێت ....
(خەدیجە) ش بەدەوری خزمەتکاری (زید) کردیە دیاری بۆ هاوسەرەکەی (پێغەمبەری خوا) ﷺ ، ئەویش بە کەیف خۆشی وەریگرت و هەر لەم کاتەدا ئازادی کرد ، هەموو بەزەیی و چاو دێریەکی دڵە گەورە دەروون پاکەکەی مەرەخەست کرد بۆ (زەید) ...

لە یەکێک لە مەوسیمەکانی حەج ، یەکێک لە خەڵکی (حاریثە) دەگا بە زەید لە مەککە ، پەرۆشی دایک وباوکی بۆ زەید دەگێڕێتەوە ، زەیدیش سڵاو و خۆشەویستی خۆی رەوانە کرد بەم پیاوە بۆ دایک باوکی ، بە حاجیەکانی میللەتەکەی خۆی گووت :
[بە باوکم بڵێ من لێرەدا لەگەڵ بەڕێزترین و باشترین باوکم] ....
هێشتان باوکی زەید بە جێگیر بوونی کوڕەکەی تازە زانیبوو ، یەکسەر لەگەڵ برایەکەی ملی ڕێگایان گرت ، لە مەککە مانەوە پرسیاری (محمدالامین) یان کرد ، کاتێک دۆزیانەوە و پێ گەیشتن ، پێیان گووت :
[ئەی کوڕی عبدالمطلب) .... ئەی کوڕی گەورەی میللەتەکەی ..... ئێوە خاوەن حەرەمن ، دەستی لێ قەوماوان دەگرن و ، نانی دیل دەدەن ..... هاتینە لات بۆ منداڵەکەمان منەتمان لەسەر بکەو لە کڕینەوەی لەگەڵمان چاک بە] ....
پێغەمبەری خوا ﷺ دەیزانی زەید بەوی بەندە ، لەهەمان کاتیشدا ڕێزی باوکی دەگرت بۆ زەید .... لێرەدا بە حاریثەی گووت : [بانگی زەید بکەن ، سەرپشکی بکەن ، ئەگەر ئێوەی هەڵبژارد بۆ ئێوە بێت بەبێ پارەوە فدیە ، ئەگەر منیشی هەڵبژارد سوێند بەخوا یەکێک من هەڵبژێری پێی ناوێت من بڵێم ئەوم دەوێت یان نا ....] ..!!
ڕووی حاریثە بەم ووتە شیرینانەی پێغەمبەر ﷺ گەش بۆوە هەرگیز چاوەڕوانی ئەم لێ بووردنەی پێغەمبەری نەدەکرد ، حاریثە پێی گووت : [بەڕاستی چاکەت لە گەڵ کردین ، لە چاکەش زیاتر] ....
پاشان پێغەمبەر ﷺ بەدوای زەیدی دا نارد ، کاتێک هات پێی گووت :
[ئایا ئەوانە دەناسی] ..... ؟؟
زەید گووت : بەڵێ ، ئەوە باوکمە وئەوە مامە ....
پێغەمبەر ﷺ ئەم قسانەی بە حاریثە ی گووت ..... بۆزەیدی گێڕایەوە ....
ئنجا لێرەدا زەید بەپێغەمبەری گووت :
[من ناتوانم کەس لەسەرە تۆ هەڵبژێرم ، تۆ باوک و مامی ...!!] .
چاوەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ پڕ بوو لە فرمێسکی خۆشەویستی وسوپاسمەندی ، پاشان دەستی زەیدی گرت و بردی بۆ حەوشی کەعبەو ، کەوا قورەیش لەوێ کۆبوونەوە ، پێغەمبەر ﷺ بانگی کرد .
[شاهیدی بدەن زەید کوڕی منە ، میراتم دەگرێ ومیراتی دەگرم] ...!!

حاریثە لە خۆشیان باڵی گرت .... کورەکەی ئێستا تەنها ئازاد نیە ... بەڵکو کوڕی پیاوێکە قورەیش پێ دەڵێن (ڕاستگۆی ئەمین) نەوەی هاشم ، جێگای ڕێزی هەموو مەککەیەکانە ...

باوک و مامەکە گەڕانەوە بۆ ناو میللەتەکەیان ، پاش ئەوەی دڵنیا بوون لە کوڕەکەیان و لەلای گەورەی مەکە بەجێیان هێشت ، بە ئەمینی وبەخۆشی ، کاتێک باوکی نەیدەزانی کوڕەکەیان: دەشت قووتی داوە ، یان چیا قووتی داوە.

پێغەمبەر زەیدی کرد بە کوڕی خۆی ..... وای لی‌هات لە مەککە نەیان دەناسیوە تەنها بە ناوی زەیدی کوڕی محمد نەبێت .....

وە لە ڕۆژێکی ڕوون و پرشنگدار ، نیگا موحەممەدی بانگ کرد :

[اقرا باسم ربك الذي خلق ، خلق الانسان من علق ، اقرا ، وربك الاكرم ، الذي علم بالقلم ، علم الانسان ما لم يعلم] .....

پاشان چەند نیگایەکی تری بەدوادا هات ، بەم ووشە پیرۆزانە :

[يا ايها المدثر ، قم فانذر ، وربك فكبر] ....

هەر کە پێغەمبەری خوا ﷺ پەیامی پێغەمبەرایەتی هەڵگرت ، زەید بووە دووەم مسوڵمان ، بەڵکو دەڵێن یەکەم مسوڵمان بوو .....!!

پێغەمبەری خوا ﷺ زەیدی زۆر زۆر خۆش دەویست ، کەوا ئەم خۆشویستیەش شایانی زەید بووە ... وەفایەکی ناوەهای بۆ هەبوو ، چەشنی نەبوو ، وەپاکی دەروون و ویژدان و زمان و دەستیشی لە گەڵیدا .....

هەموو ئەم سیفاتە بەرزانە زەیدی کوڕی حاریثەی لەپێش چاوی پێغەمبەری خوا ﷺ جوان کرد بوو ، ببووە (زەیدی خۆشەویست) ، هەروەک پێغەمبەر ﷺ ئەم نازناوەی لی نابوو ...

دایکی مسوڵمانان عائیشە (خوا لی‌ی ڕازی بێت) دەفەرمووێت :-

[ پێغەمبەری خوا ﷺ هەر لە شکرێکی ڕەوانە بکردایە زەیدی کوڕی حاریثەی لەناویایە ، تەنها ئەوەی دەکرد بە ئەمیر لەسەریان ، ئەگەر لەپاش پێغەمبەریش بمایە دەیکرد بە خەلیفە] ...

شوێن وجێگای زەید لەلای پێغەمبەری خوا گەیشتە ئەم پلەو پایەیە ....

ئەم زەیدە کاتی خۆی چ بوو ئێستا وا بەرز بۆوە ؟

هەروەکو گوتمان ... ئەم منداڵە کرا بە غەنیمەو ، پاشان فرۆشرا ، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ئازادی کرد ..... پیاوێکی کورتە باڵا ، ڕەش ئەسمەر ، لووت پانی ئەفنەس ، دڵی ئەوەندەی لەشی بوو ، بەجۆرێک شوێنی خۆی لەناو دڵی هەموو موسلمانان کرد بۆوە ....

هەروەها شوێنی خۆی لە ئیسلام و لە دڵی پێغەمبەری خوا ﷺ کردبۆوە و بەرز ترین پلەو بڵندترین جێگای وەرگرت ، نە بە بنەماڵە ونە بە ڕووخسار .... بەڵێ بەم جۆرە ئیسلام ئەوانەی کرد بە باشترین مسوڵمان و پێشەوا .... ڕاستی فەرمووە خوا گەورە کە دەفەرموێت : [ان اكرمكم عند الله اتقاكم] ...

بەڵام پاش ئەوەی خوای گەورە فەرمانی دا کەس نابێتە کوڕی کەس ، ئەوەبوو ناوی (زەیدی کوڕی موحەممەد) گەڕاوە بۆ ناوی یەکەم جاری (زەیدی کوڕی حارثە) ..

ئەم فەرمانەش بەم ئایەتە پیرۆزە بوو :- [ما كان محمد ابا احد من رجالكم ، ولكن رسول الله ، وخاتم النبيين]

ئێستاش ... دەبینن ئەو هێزە مسوڵمانەی کەوا دەرچوو بۆ جەنگی (جموح) ... ئەمیرەکەی (زەیدی کوڕی حارثە) بوو ... هەروەها ئەو هێزانەی دەرچوون بۆ جەنگەکانی (الطرف) و (العيص) و (حسمي) و جەنگەکانی تر .. هەموو ئەمیرەکانی ئەم جەنگانە (زەیدی کوڕی حارثە) بوو .. هەتاکو جەنگی (موئتە) هات ....

ڕۆمەکان لەگەڵ ئیمپریاتۆرە پیر بووەکەیان ، دەستیان کرد بەوەی سنوورێک بۆ ئیسلام دابنێن و ترسێکیان لێ نیشت .... بەڵکو پاشان وایان تەماشاکرد مەترسی ئیسلام لەسەر ئەوان ، ڕوو لە خودی ئەوانیش دەکات .... بەتایبەتی لە وولاتی شام کەببووە موستەعمەرەیەک بۆ ئەوان و کەوتبووە سەر سنووری ئەم ئاینە نوێیە . بەم جۆرە سەنگەرەکانیان هێنا بۆ سنووری وولاتی شام ودوورگەی عەرەبی بۆ دەستپێکردنی سەرەتای پەلاماردان .

پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئامانجی ڕۆمەکانی زانی کەوا دەیانویست دەست پێشخەری بکەن بۆ سەر ئیسلام ، بڕیاری دا بەرەنگاریان ببێتەوەو ، قەناعەتیان پێ بهێنێ لەسەر ئەوەی ئیسلام نەخشەی بەرگری کردنی هەیە .

بەم جۆرە لە جەمادی یەکەمی ساڵی هەشتەمی کۆچی سوپای ئیسلام دەرچوو بۆ خاکی (البلقاء) لە شام، هەتاکو دەستیان بگاتە سوپای هیرقل لە ڕۆمەکان و ئەو هۆزە موستەعرەبانەی کەوتبووتە سەر سنوور ...

سوپای ڕۆم گەیشتە شوێنێک پێی دەڵێن (مشارف)، هەروەها سوپای ئیسلام لە شوێنێکیان خست کە پێیان دەگووت (مؤتە)، هەروەها ناوی جەنگەکەشیان هەر بەم ناوەنا ....

پێغەمبەری خوا ﷺ گرنگی ئەم هێرشەو مەترسی لەسەر ئیسلام دەزانی، لەبەر ئەوە سێ ئەصحابەی لە خوا ترسی پیاوی ڕۆژو شەوانی بۆ هەڵبژاردن ... سێ کەس لەوانەی خۆیان فرۆشتبوو بۆ خودا هیچ مەبەست و نیازێکیان نەبوو تەنها شەهید بوونەکی سەر بەرزانە نەبێت، کەوا ڕەزامەندی خوای گەورەی لەناو بێت و ڕووی پیرۆزی خوای پێ ببینن ....

ئەم سێ کەسەی کەوا سەرکردایەتی لە شکریان دەکرد ئەمانە بوون:* زەیدی کوڕی حاریثە... * جەعفەری کوڕی ابي طالب .... * عەبدولاّی کوڕی ڕەواحە ... (خوا لێیان ڕازی بێت) ...

بەم جۆرە بینیمان چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک وەستا بوو، خوا حافیزی لە سوپاکەی دەکردو دەیفەرموو:- [زەیدی کوڕی حاریثە سەرکردایەتیان دەکات، ئەگەر زەید لێدرا، جەعفەری کوڕی ابي طالب سەرکردایەتیتان بکات، ئەگەر جەعفەریش لێدرا، عەبدولاّی کوڕی ڕەواحە سەرکردایەتیتان دەکات].

لەگەڵ ئەوەی (جەعفەری کوڕی ابي طالب) نزیکترین کەس لەبەر دڵی پێغەمبەری خوا ﷺ و کوڕی مامی بوو ... هەرچەند زۆر بە غیرەت وئازا بوو، لەبنەماڵەیەکی پیرۆز بوو، ئەوە بوو پێغەمبەر ﷺ زەیدی لەسەرکردە ئەمیرو، ئەوی کرد بە سەرکردەی دووەم ...

بەم جۆرە ئیسلام هات، هەموو داب و نەریتێکی خزم خزمێنە و دووری و نزیکی لابرد، بەڵکو لە جێگای ئەو چەند پەیوەندی یەکی نوێی دادپەروەرانەی دانا لەسەر بنچینەی مرۆڤایەتی ڕەسەن ...!! دەتگوت پێغەمبەری خوا ﷺ نهێنی یەکانی ئەم شەڕە دەخوێنێتەوەو لەپێش چاویەتی دەزانێ سەرەنجام چۆن دەبێت ...!!؟ بەم جۆرەی ئەو فەرمووی :- یەک لەدوای یەک لێ دران و شەهید بوون (زەید) ئنجا (جعفر) ئنجا (عبدالله)....

مسولّمانان چاوەڕوانی ئەوەیان نەدەکرد کەوا ئەو هەموو سەربازەی لە شکری ڕۆمیان بۆبێتە مەیدان کەوا ژمارەیان خۆی لە دووسەد هەزار شەڕکەر دەدا ...
بەلاّم کەی جەنگی ئیمان حیسابی بۆ زۆری دوژمن کردیە ...
لێرەدا لێیان چوونە پێشەوە و گوێیان بەمە نەدا ... لە پێشەوەیان سەرۆکیان (زەید) ئالای پێغەمبەری خوای ﷺ هەڵگرتبوو ... کەوا پێشیان یەک پارچە ڕم وتیرو شمیشێر بوو .. لەبەر ئەوەی (زەید) ئەوەندە بەدوای شەهید بوون دەگەڕا کەوا پەیمانێکی بازرگانی بوو خۆی ومالّی فرۆشتبوو بە خوای گەورە بەرامبەر بە بەهەشتەکەی .. زەید گوێ بەژمارە و ماندووبوونی بەلقاء نەدا ، بەلّکو چاوەڕێی دەکرد چۆن ئەوان بکات بە پردو بەسەریان دا بپەڕێتەوە بۆ بەهەشت و بگات بەم خۆشیە ، بەلّکو ئەم ڕۆژەی بە ڕۆژی زەماوەندی دەزانی ... بەم جۆرە زەید لە دوژمنی دەداو شەڕی دەکرد ، بەسەر کەلاکی دوژمنانی ئیسلام پەڕیەوەو دەرگاکانی بەهەشتی لی کراوە گەیشت بە بەهەشتی هەتاهەتایی ، بە هەشتەکانی فیردەوس ،بووە میوانی خوای گەورە .
بەم جۆرە زەید دەست لە ملاتی چارەنووسی خۆی کرد ... هەروەها ڕۆحە پاکەکەی بەرێ کەوت بۆ بەهەشت بەتەواوی پەڕیوە ، لاشە پیرۆزەکەی بە حەریری نەرم هەڵنەگیرا ، بەلّکو خوێنە پاکە ڕۆیشتووەکەی تێکەڵ بە خۆڵ بوو لە پێناوی خوای گەورە ...
بەلێ لەوکاتەی لاشە پیرۆزەکەی کەوتبووە سەر زەوی ، ئەمجارەیان جەعفەر وەکوتیری ناو کەوانە گەیشتە سەری و ئالای هەڵگرتەوە و بلندی کردەوە ، پێش ئەوەی تۆزو غوباری بکەوێتە سەر ... بەڕاستی زەیدی کوڕی حاریثە بە وەفا و ڕاستگۆ و موجاهید بوو ، بۆ خوای گەورە ژیاو ، خۆی فرۆشتە خوا ...
سلاّوی خوا لە گیانی پاکی زەیدو جەعفەرو عەبدولاّ بێت .

٩

# زەیدی کوڕی خەطاب

## هەڵۆی ڕۆژی یەمامە

## ﴿٩﴾

# زەیدی کوڕی خەطاب

## هەڵۆی ڕۆژی یەمامە

ڕۆژێک پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبوو ، کۆمەڵێک ئەصحابەی بەڕێزی لە دەورە بوو و قسەی بۆ دەکردن ، تۆزێک داماو ئنجا رووی لەوانەی دەورویەری کردو فەرمووی: [ان فیکم لرجلا ضرسه في النار اعظم من جبل احد] ....
[پیاوێک لەناو ئێوەدا هەیە ددانی کەڵبەی لەناو ئاگرادا لەچیای ئوحد گەورەتره] ،
هەموو ئەو کەسانەی کە لەگەڵ ئەم کۆڕەی پێغەمبەر دابوون ﷺ ترس وگومانیان لە خۆدەکرد ، هەر یەکێک لەمانە لەوە دەترسا ئەم چارەڕەشی یە ئەو بگرێتەوە ....
بەلاّم هەموو ئەوانەی لەم کۆڕە بەشدار بوون و ڕوویان تێکرا ، ئاخیریان خێر بوو ، بەڵکو خوای گەورە بەشەهیدی هەڵیبژاردن ، هیچیان بە زیندوویی نەمانەوە تەنها (ابو هریره) و (ڕەجاڵ کوڕی عنفوه) نەبێت ...
(ابو هریره) خوا لیی ڕازی بێت خەو و خۆراکی نەبوو لە ترسی ئەوەی نەوەکو ئەم نیگایەی پێغەمبەر ﷺ ئەو بگرێتەوە ، هیچ حەسانەوەی نەبوو ، تاکو خوای گەورە بە توانای خۆی ئەم نهێنی یەی ئاشکرا کرد لەسەر خاوەن بەدبەختێک ، (رەجال) هەڵگەڕاوە لە ئیسلام و خۆی گەیاندە (موسەیلەمە)ی درۆزن ، نیگاکە هاتە جێ.
لێرەدا (رجالـە کوڕی عنفوه) ئەو پیاوەی پێغەمبەر ﷺ ناوی هێنا بە بەدبەخت وچارە ڕەش ، ئەم پیاوە ڕۆژێک هاتە لای پێغەمبەر ﷺ بەڵێن وپەیمانی لەگەڵی بەست مسوڵمان بوو ، فێرە ئیسلامیان کردو گەڕاوە بۆناو میللەتەکەی ،نەگەڕاوە بۆ شاری مەدینە تەنها پاش کۆچی دوایی پێغەمبەر نەبێت ،کەوا لە پاشان مسوڵمانان (ابوبکری صدیق) یان هەڵبژارد بە خەلیفە ... دەنگ وباس گەیشتە ئیمام (ابو بکر) کە خەڵکی (یەمامە) لەدەوری (موسەیلەمە) کۆبوونەتەوە ، لە ئیسلام هەڵگەڕاینەوە (رجال) وای پێشنیار کرد بە ئیمام (ابوبکر) بینێری بۆ لایان بۆ ئەوەی بیانگێڕێتەوە سەر ئیسلام ، خەلیفەش ڕێگای پێدا .. (رجال) ڕووی کردە خەڵکی یەمامە .... بەلاّم کاتێک بینی ژمارەیان ئێجگار زۆرە ، وا گومانی برد ئەوان سەرکەوتوون ، لەگەڵ دەروونی ناپاکی خۆی دواو ، کەوا شوێنێک لە دەوڵەتی (کذاب) بۆخۆی بگرێ ، چونکە واگومانی دەبرد لەم ڕۆژانە پێی دەگات ، وازی لە

ئیسلام هێنا ، پاڵی دایە ڕیزەکانی (مسیلمە) و بەڵێنی پێدان!! مەترسی (رجال) لەسەر ئیسلام گەورەتر بوو لە مەترسی (مسیلمە) ...

لەبەر ئەوەی ، موسلمان بوونەکەی بۆ مەبەستی خۆی بەکارهێنا ، ماوەیەک ژیا لە مەدینە لە ڕۆژگاری ژیانی پێغەمبەردا ﷺ ، زۆر لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزی لەبەر کرد ، کرا بە نوێنەری ابوبکری خەلیفەی مسوڵمانان ..... ئەم شتەی بۆ خۆی بەکارهێنا ، یە بەکارهێنانێکی بۆگەن بۆ یارمەتی دانی (مسیلمە) و ، بەڕاست دانانی پێغەمبەرایەتیە درۆزنەکەی .....

لەناو خەڵک بڵاوبۆوە دەیانگووت ، (رجال) گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە : (کەوا مسیلمەی کوڕی حبیب بەشدارە لە پێغەمبەرایەتی) ... ما دام پێغەمبەر ﷺ مرد ، باشترین کەس بۆ هەڵگرتنی ئالاو نیگاکەی لەپاشە خۆی ، موسەیلەمەیە !!!..... شوێنکەوتوانی (مسیلمە) بە ڕادە بەدەر لەزیاد بوون دابوون ، بەهۆی درۆیەکانی (رجال) ... بەهۆی بەکارهێنانە فێڵاویەکەی پەیوەندی پێشووی بە ئیسلام و پێغەمبەر ، دەنگوباسی (رجال) گەیشتە مەدینە ، مسوڵمانان لە تورەییان گریان گرت لەبەر ئەو هەڵگەڕاوە مەترسی دارەی کە خەڵک تووشی گومڕاییەکی زۆر دەکات ، کە بووە هۆی هەڵگیرساندنی کۆمەڵە شەڕێک ، مسوڵمانەکانی ناچارکرد بیکەن ..... (زەیدی کوڕی خەطاب) لەهەموو مسوڵمانان زیاتر رقە وقینی هەڵسابوو ، بە پەرۆش بوو بگات بە (رجال) تاسەری بپەڕێنێ هەروەک مێژووی زێڕینی ئیسلام لە پەرتووکەکانی سیرەدا ناوی ئەم باوەڕدارە بەڕێزەمان بەیاد دەهێنێتەوە ....

بەڵێ زەیدی کوڕی خەطاب ..؟؟؟

بێگومان دەبێ ئێوە ناسیبتان ....

زەید برای (عمری کوڕی خەطاب) ە خوا لێیان ڕازی بێت ...

بەڵێ ...... برای گەورەیەتی ....

پێش ئەو لە دایک بووەو .... لە ئەو گەورەتر بوو ...

پێش ئەو بوو بە ئیسلام و .... هەروەک پێش ئەو گەیشتە پلەی شەهیدی لە پێناوی خوای گەورە .....

(زەید) پاڵەوانێکی مەردو کارامەو ، کارەکانی بەنهێنی بوو ، ئەم بێدەنگیەشی کاکڵەی ئازایەتیەکەی بوو ....

هەروەها بڕوای بەخواو بە پێغەمبەرو بە ئایینەکەی بڕوایی یەکی پتەو بوو ، لەهیچ ڕووداو و غەزایەک لە پێغەمبەری خوا ﷺ بەدوا نەکەوتووە ...

لەهەموو دیمانەکانیش ئەوەندەی بەدوای شەهیدی گەڕاوە ، لەدوای سەرکەوتن نەگەڕاوە ڕۆژی ئوحد کاتێک جەنگ لەنێوان کافرە قورەیشیەکان و بڕواداران گەرم بوو ، زەیدی کوڕی خەطاب شێر ئاسا دەیبڕی و دەیکوشت ...

(عمری کوڕی خەطاب) دیتی زەیدی برای زرێیەکەی کەوت ، کەوتە مەترسی کوشتنی بەدەست دوژمنەکانی ، (عمر) هاواری کردو فەرمووی :. [زەید زرێیەکەی من بگرەو ، شەڕی پێبکە] ...

زەید وەلامی دایەوەو گووتی :

، من شەهیدیم دەوێ ، هەروەکو خۆت دەتەوێ ئەی عومەر ...

بەم جۆرە زەید بە قارەمانیەکی بێ ئەندازە شەڕی کرد ، بە بێ زرێ ..

گووتمان : زەید خوا لێی ڕازی بێت ، گڕی گرتبوو بۆ ئەوەی زوو بگات بە (رجال) وە تەمەنای ئەوەی دەکرد ئەو بە تەنها خۆی بگات بەم بەدکارە ، بە بیرو باوەڕی (زەید) (رجال) تەنها هەڵگەڕاوە نەبوو ، بەڵکو درۆزن و دووڕوو هەڵپەرست بوو .... چونکە ئەو کەسانەی ئیسلام بەکار دەهێنن بۆ ئارەزووی دنیایی لەلای زەید خراپترین کەس ... ڕک لێی بوونەوەی زەید لە دووڕوویی و درۆ ، بەتەواوی وەک و عومەری برای بوو ..

لەپێناوی ئەم ئارەزووە سووک وکەمانەدا ، (رجال) دەورێکی پیسی دیت ، وای کرد ئەوانەی دەورەی (مسیلمە) یان داوە زیاتر باری گوناە هەڵبگرن ، بەم جۆرە بە دەستی خۆی بەرەو مردن بەرێیان کات و ژمارەیەکی زۆریشیان بە فەوتان بدات و لە جەنگی هەڵگەڕاوەکان ، یەکەم جار گومڕای کردن ....!!

دووەم جار بە فەوتان وهیلاکی بردن ...!!!

لە پێناوی چی ... ؟! لەپێناوی چەند ئارەزوویەکی بۆگەن کە دەروونی بۆی ڕازندبونەوە ، شەیتان بۆی جوان کردبوو ،......

زەید خۆی ئامادە کرد بۆ ئەوەی ئەم ژیانە بڕواداریەی بە لەناوچوونی ئەم فیتنەو ئاژاوەیە کۆتایی پێ بێنێ ، نەک بۆ لەناو بردنی کەسایەتی (مسیلمە) بەڵکو بۆ کەسانێک لەو مەترسیدار تر بوون بۆ ئیسلام ، ئەویش (رجال کوڕی عونفوە) بوو ... جەنگی یەمامەی مەترسی دارو دژوار دەستی پێکرد .... (خالیدی کوڕی وەلید)

سوپای ئیسلامی کۆکردەوە ، بەسەر شوێنەکان دابەشی کردن ، ئاخۆ دەبێ ئالآی دابێتە دەست کێ لەم سوپایە ... ؟!!!

بەڵێ دایە دەست زەیدی کوڕی خەطاب ... شەڕێکی یەکجار گەورەی کرد لەگەڵ نەوەی (حنیفە) ، شەرێکی دژوارو گەرم ...... جەنگەکە لەسەرەتادا بەسەر مسوڵماناندا شکایەوە ، شەهیدێکی زۆریان دا ...

زەید بینی ترس رووی لە دڵ و دەروونی مسوڵمانان کردووە ، بەسەر بڵندایی یەک سەرکەوت ، هاواری برا موجاهیدەکانی کرد :-

[ئەی خەڵکینە ... ددانتان لێ یان چیرکەنەوەو ، لە دوژمنەکانتان بدەن بە زەیی تان پی یان نێنەوە ، بڕۆن بۆ پێشەوە ، سوێند بە خوا قسە ناکەم هەتا خوا نەیان شکێنێت . یان خوای گەورە شەهیدم دەکات وقسە بە بەڵگەکانم دەکەم] .... لە شوێنە بڵندەکە هاتە خوارەوە ، ددانی لێ چیرکردنەوەو ، دەمی بۆ ژوورەوە بردەوە ، زمانی جوڵەی نەکرد ... وای دانا بوو چارە نووسی ئەم جەنگە بە (رجال) ەوە بەستراوە ، هەروەک چۆن تیر لە کەوانەکەی دەردەچوو ئەوها ڕیزەکانی دوژمنی دەبڕی ، بەدوای (رجال) دا دەگەڕا هەتا دۆزیەوە ... بەلاّم لەشکر لە ڕاست و چەپ بۆی دەهات !! هەرکە شالاّوی جەنگی دەبڕی دووبارە لی ی بزر دەبۆوە ، دووبارە شالاّوی دوژمنی بڕی ، (زید) لی ی نزیک بۆوە شمشێرەکەی دەستی بۆ درێژ کرد ، بەلاّم لافاوی جەنگە سێ پارە (رجال) ی بزر کرد ، زەید بەدوای دەگەڕا بۆ ئەوەی لە دەستی نەچێت ...

لە کۆتایی دا زەید شمشێرەکەی لەملی (رجال) هەڵێناو سەری درۆزن و لەخۆبایی نەگرسیی کەوتە سەر زەوی ..... بە لەناو چوونی ئەم درۆزنە ، وای کرد ترس بکەوێتە دڵی دوژمنان و ، یەک لە دوای یەک دوژمنان دەکەوتنە سەر زەوی ، هەتا ئەم ترسە ڕووی لە دەروونی (مسیلمە) و (محکم کوڕی عوفەیل) کرد ، وەک و چۆن گەردەلوول ئاگر بە پێشە خۆی دەدا ، ئاوەها ترس کەوتە سوپاکەی (مسیلمە) ...

(مسیلمە) بەڵێنی پێ دابوون بە سەرکەوتنێکی یەکجارەکی و ، رجال و محکم یش بەیانی کە سەرکەوتنیان بە دەست هێنا ، هەڵدەستن بە بلاّوکردنەوەی ئایینەکەی و دامەزراندنی دەوڵەتەکەی ......!!

بەم جۆرە (رجال) کوژراو کەوتە سەر زەوی ، کەواتە نیگاکانی (مسیلمە) بەدرۆ دەرچوو ، بەیانیش (محکم) دەکوژرێ و دوو بەیانیش مسیلمە ...!!

بەڵێ بەم جۆرە ئەو لێدانەی (زیدی کوڕی خەطاب) کاری کردە سەر ڕیزەکانی (مسیلمە) و شکستی پێ هێنان ...
بەلاّم مسوڵمانان ، هەر کە ئەم دەنگ و باسەیان بۆ هات ورەیان وەکو چیا بەرز بۆوە ، هەر دەتبینی بریندارەکان سەر لە نوێ ، دەست دەدەنەوە شمشێرەکانیان و ، بەبێ ئەوەی گوێ بدەنە ئازاری برینەکانیان بەرەو مەیدانی جەنگ ڕادەپەڕین ...
ئەم دەنگوباسە وەکو خەون دای بە گوێچکەی ئەوانەی لە قەراغی مردن دا بوون ئەگەر هاتوو هێزیان لەبەر مابایە ، دووبارە ئەوانیش دەستیان دەدا شمشێرەکانیان و شەڕیان دەکرد ، بۆ ئەوەی ئەم سەرکەوتنە لە کۆتایی ژیانیان دا بە چاوی خۆیان ببینن..
بەلاّم ئەم شتە بۆ وان نابێت ، لەبەر ئەوە خوای گەورە دەرگاکانی بەهەشتی بۆ کردینەوەو پێشوازیان لی دەکات و ، بانگیان دەکات بۆ پاداش وەرگرتنەوە. ؟!!
(زەیدی کوڕی خەطاب) دەستەکانی بۆ ئاسمان بەرزکردەوە دوعای سوپاس وستایشی خوای کرد ، بەرامبەر ئەو نیعمەتەی لەگەڵی کردن ....
پاشان گەڕاوە بۆ سەر شمشێرەکەی ، بۆ سەر هێمنی و لەسەرەخۆیی یەکەی ، سوێندی خوارد بەخوا کەوا قسە لەگەڵ کەس نەکات هەتا سەرکەوتن بە دەست دەهێنێ یان شەهید دەبێ ...
ئەمجارە شەڕەکە بای مسوڵمانان بوو و ، بەزووترین کات سەرکەوتنیان لەلایەن خواوە بۆهات .... لێرەدا (زەید) سروودی سەرکەوتنی بە چاوی خۆی بینی ، ئەشیزانی ژیانی کۆتایی پێ دێت ، بە خۆشترین کۆتایی هاتن ، تەمەنای دەکرد هیواو ئاواتی ئەوە بوو لەم جەنگەی یەمامەدا خوای گەورە پلەی شەهیدی پێ ببەخشێ ...
کزە بایەکی فێنک لە بەهەشتەوە هەڵیکرد ، دای بەسەر دڵ و دەروونی (زەید) وفرمێسک لە چاوەکانی گیر نەبوو و ، وورەی زیاتر بەرز بۆوە ، دووبارە کەوتە ناو دوژمنان ودەتگووت چارەنووسی بەدوای چارەنووسێکی زۆر مەزن دەگەڕێت ...
قارەمانی شەهید کەوتە سەر زەوی ....
بەڵکو بڵێین : شەهید بەرزبۆوە بۆ ئاسمان .. گەورە بوو .... پلەی بەرز بوو ...
سوپای ئیسلام بە سەرکەوتوویی گەڕاوە بۆ شاری مەدینەی پیرۆز ...
لێرەدا عومەر و خەلیفەی مسوڵمانان پێشوازی دەکەن لەوانەی بەسەرکەوتوویی گەڕانەوە ... عومەر زۆر بە پەرۆش بوو چاوی بکەوێ بە برا موجاهیدە گەڕاوەکەی ...
زەید بالآی بەرز بوو ، بە ئاسانی لە دوورەوە بە چاو دەبینرا ..

بەلاّم پێش ئەوەی عومـەر چاوی بڵندکاو ببینێ ، مسـوڵمانە موجاهیدە گەڕاوەکان پرسەی سەرەخۆشی زەیدیان لی کرد ...

عومەر (خوا لیی ڕازی بێت) فەرمووی :ـ [ڕەحمەتی خوا لە زەید بێت ... بە دوو سەرکەوتن بە پێشم کەوت .. پێشەمن مسوڵمان بوو و پێشەمن شەهید بوو] ... لە هەموو ئەو سەرکەوتنانەی ئیسلام بە دەستی دەهێنا ، ئیمام عومەر بە هیچ جۆرێک پلەو پایەی زەیدی لەیاد نەدەچوو .. هەموو کات دەیفەرموو : [هەر شنە بایەک هەڵبکا ، بۆنی زەید لە گەڵ خۆی دەهێنێت] ... بەڵێ .. لە ڕۆژی یەمامەوە تا ئێستا هەر شنە بایەکی سەرکەوتن هەڵیکردبێ بۆنی زەیدو ، قارەمانیەتی زەیدو ، گەورەیی زەیدمان بە یاد دەهێنێتەوە .

عومەری کوڕی خەتاب (خوا لیی ڕازی بێت) لە دڵی خۆیدا زۆر غەمبار بووە ، عومەر کاتێک چاوی بە بکوژی براکەی دەکەوت زۆر ڕقی هەڵدەستا ، بەلاّم هیچ چارەی نەبوو لەبەر ئەوەی بکوژەکە مسوڵمان ببوو ، هەتا ڕۆژێک بیسی پیی گووت: مـن ئەوەندە ڕقم لە تۆیە ، هەروەک زەوی ڕقی لـە خوێنـە .. (چونکە زەوی خوێن هەڵنامژێ ، بەڵکو خوێنەکە لەسەری دەمەێت ..] .....

ڕۆژێک لە ڕۆژان (متمم کوڕی نویره) چاوی پیی دەکەوێ ، کاتێک دونیای پڕ لە خەم وگریان کرد بوو بە کوژرانی براکەی ، هەڵبەست و شیعری بەسەر برایەکەی هەڵدەگووت ، عومەر پیی گووت : ئەگەر منیش هەڵبەستم بزانیایە ، هەڵبەستم بەسەر برایکەم دا دەگووت ... !! متمم پیی گووت : ئەگەر برای من بەوە ڕۆیشتبایە کە برای تۆی پێ ڕۆیشتووە ، خەمم بۆ نەدەخوارد .... !!

عومەر پیی گووت : کەس نەیتوانیوە خەمی زەیدم لەیاد بباتەوە ، هەروەکو تۆ لە یادت بردمەوە ....

لێت پیرۆز بێت ئەی زەید ئەو ڕۆژەی مسوڵمان بوویت ..

لێت پیرۆز بێت ئەی زەید ئەو ڕۆژانەی جیهادت لە پێناوی خوای گەورەکرد ...

لێت پیرۆز بێت ئەی زەید ڕۆژی شەهید بوونت .

﴿١٠﴾

# خوبەیب کوڕی عەدی

## شەهیدی لە سێدارەدراو

فەرموون ئێستاکە ....
ڕێگا بکەنەوە بۆ ئەو قارەمانە ئەی مێرخاسان ...
وەرن لە هەموو شوێنێک و جێگایەک ...
وەرن بێ هێزو بەهێز ، نەخۆش و لەش ساغ ...
وەرن زۆر بە پەلەو مل کەچی ... بۆ ئەوەی دەرسێک وەربگرن لە خۆبەخت کردن ، دەرسێک هیچ وێنەی نەبێ ...!! پاشان دەڵێن : بەڕاستی ئەو دەرسەی بە ئێمەتان گووت لە ژیانماندا گوێمان لە شتی وا نەبووەو وێنەشی نەبووە ... ؟!!
بەڵێ . . ئەوانە دەرس بوون .... لە جوانیدا هیچ نموونە و وێنەیان نەبووە ... بەڵام ئێستا بەرامبەر مامۆستایەکی نوێ دەوەستین لە هونەری بەرخودان ....
مامۆستایەکی وایە ئەگەر ئەم بەسەرهاتەتان لەدەست بچێت ، خێرێکی زۆر زۆرتان لەدەست دەچێ ...
وەرنە لامان ئەی خاوەن بڕواکان ، لەهەر وولاتێک ولەهەر میللەتێک بن ...
وەرنە لامان ئەی ئاشقانی شەهیدی لە هەموو سەردەمێک و ساتێک ...
لەگەڵ ئێوەشمانە ئەی ئەوانەی غرور دایگرتوونەو ، گومانی خراپ دەبەن بە بڕواو ئایینەکان ...
وەرن ئێوەش ، ئەی ئەوانەی لە هەق و مردن دەترسێن ...
وەرن بزانن چۆن ئیسلام چۆن ئایینی خوا ، مێرخاسان پەروەردە دەکات ...
وەرن و تەماشاکەن ئەمە چ عیززەتێکە ، چ قەلغانێکە ، چ خۆڕاگریەکە ، چ خۆبەخت کردنێکە ، چ گوێ ڕایەلیەکە .... چ ئیمانێکە ...!!
ئایا ئەم تەرمە لە سێدارە دراوە دەبینن ... ؟؟!
ئەمە بابەتی وانەی ئەمڕۆمانە . . براو خوشکە خوێنەرەکان ...
ئەو تەرمە لە سێدارە دراوەی پێشمان و ئەو دەرسەو ئەو مامۆستایە ... ناوی (خوبەیبی کوڕی عەدی)یە ...

بەهیچ جۆرێک ئەم ناوە پیرۆزە لە یاد نەکەیت و لەبیرتان نەچێت ... لە بەریکەن و ، هەڵبەستی پێدا هەڵبڵێن ئەم شەهیدە شەرەفە بۆ هەموو ئادەمیزادێک .. لەهەموو ئایینێک و مەزهەبێک و ، لە هەموو زەمانێک ...

ئەم شەهیدە لە هۆزی ئەوسی مەدینەیەوە لە یاریدەدەرەکانە ...

لە دەورەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەر لەو کاتەی کۆچی کرد بۆ مەدینە ، بڕوای بە خوای پەروەردگار هێنا ... گیانێکی پاک و ، دەروونێکی بێ گەردو ، بڕوایەکی پتەو و ، ویژدانێکی تیژی هەبوو .. هەروەک شاعیری ئیسلام (حەسان کوڕی ثابت) وەصفی دەکا و دەڵێ :

صقرا" توسط في الانصار منصبه          سمح السجية محضا غير مؤتشب

کاتێک (جەنگی بەدر) دەستی پێکرد ، خوبەیب سەربازێکی تێکۆشەر بوو ، وە موجاهیدێکی شەڕکەر بوو ، یەکێک لەوانەی کەوتە بەر شمشێری خوبەیب و بە دۆزەخ شاد بوو ، گاورێک بوو ناوی (حارثی کوڕی عامری کوڕی نوفل) ... پاش کۆتایی هاتنی جەنگ و ، گەڕانەوەی پاشماوە شکاوەکەی قورەیش بۆ مەکە ، ئەوەی (حارث) زانیان کێ باوکیانی تەواوکردووە و ، زۆر بەباشی ناوی ئەم مسوڵمانەیان لەبەرکرد: خوبەیب کوڕی عەدی !!

مسوڵمانانیش لە بەدر گەڕانەوە بۆ مەدینە ، خەریکی دروست کردنی کۆمەڵگایەکی نوێ بوون .. خوبەیب لە نێو چاوانی مۆرکی خواپەرستان و ڕوناکی پێوە دیار بوو لێرەدا پێشوازی دەکرد لە خواپەرستی بە گیانێکی شەیدا ... شەوان شەو نوێژو ، ڕۆژیش بە ڕۆژوو دەبوو ...

ڕۆژێک پێغەمبەری خوا ﷺ دەیویست بەنهێنی یەکانی قورەیش بزانێ ، بۆ ئەوەی هەڵوێست و جوڵانەوەیان بۆ ڕوون بێتەوە ، کەوا خۆیان ئامادە دەکرد بۆ هێرشێکی نوێ ، دە کەسی لە صەحابە مێرخاسەکانی خۆی هەڵبژارد ، لە نێوانیان (خوبەیب) وئەمیرەکەیان (عاصمی کوڕی ثابت) بوو ...

مەفرەزەکە بەرێ کەوت بۆ ئەو شوێنەی مەبەستیان بوو کەوا شوێنێک بوو لەنێوان عەسفان و مەکە ، بەلام دەنگ وباسیان بە زووترین کات گەیشتە شوێنی (هوذەیلیەکان) ، کەپێیان دەگوتن (ئەوەی حەیان) یەکسەر سەد پیاوی بلیمەت لە تیرهاوێژەکانیان بۆ ڕەوانەکردن ، ئەوە بوو بەدوایان داچوون و ، شوێن پێ یان هەڵگرتن

سەرەنجام لێیان بزر بوون ، بەڵام یەکێک لە شوێن هەڵگرەکان هەندێک ناوکە خورمای دۆزیەوە لە سەر لم ، لێکیداپەوە چونکە عەرەبەکان فیراسەیەکی زۆر سەرسوڕهێنەریان هەبوو لەم کارە ، پاشان هاواری کرد بۆ ئەوانەی لەگەڵی بوون: (ئەمە ناوکە خورمای یەثریبە ، بابچین بە شوێنی هەتا دەی دۆزینەوە) !

لەگەڵ ناوکە خورماکانی سەر زەوی ڕۆیشتن ، هەتا ئەوانیان بینی لە دوورەوە.

بەڵام (عاصم) ئەمیری دە کەسەکە هەستی کرد لە دوایانن ، داوای لە هاوەڵەکانی کرد سەر بکەون بۆ ترۆپکی چیایەک ... سەد تیرهاوێژەکە لێیان نزیک بوونەوە و ، دەوروبەری چیایەکەیان لێ گرتن ، ئابڵۆقەیان دان .... داوایان لێکردن خۆیان بدەن بەدەستەوە ، پەیمانیشیان دانێ کەوا دەستیان بۆ درێژ نەکەن بەخراپە .. مجاهیدەکان لە دەورەی ئەمیرەکەیان کە ناوی (عاصمی کوڕی ثابتی ئەنصاری) بوو ، خوا لە هەموان ڕازی بێت .. کۆبوونەوە ... چاوەڕێی فەرمانی ئەمیرەکەیان دەکرد ئەویش پێیانی فەرموو :-

[اما انا ، فوالله لا انزل في ذمة مشرك ، اللهم اخبر عنا نبيك] . واتە (بەڵام من ، سوێند بەخوا ناچمە ژێر پەیمانی گاور ، پەروەردگارا ئەم دەنگ و باسەم بگەیەنە بە پێغەمبەرەکەت) ..

تیرهاوێژەکان دەستیان بە تیرهاوێشتن کرد لە هەموو لایەک ، ئەمیرەکەیان پێی کەوت کەوا (عاصم) بوو شەهیدکرا ... هەروەها بە حەفت کەسیان کەوت و شەهید بوون ... بانگی ئەوانی تریان کرد ، بەڵێن و پەیمانیان دانی ئەگەر بێنە خوارەوە .. ئەوە بوو هەر سێکیان هاتنە خوارەوە ، خوبەیب کوڕی عەدی هاوەڵەکانی .. تیرهاوێژەکان لە خوبەیب وبرادەرەکەی کەوا (زەیدی کوڕی دثینە) بوو ، گرتیانن و بە پشتێنەکانیان بەستەیاننەوە ... بەڵام برای سێیەمیان کە بینی ئەوە سەرەتای ستەمیانە ، بڕیاریدا بمرێت چۆن عاصم و هاوڕێکانی مردن .. شەهید بوو چۆن خۆی ویستی ...

بەم جۆرە هەشت کەس لە مەزنترین بڕواداران گەیشتن بە بارەگای خواو ، بەڵێن و وەفا و ڕاستگۆیی خۆیان بە خواو پێغەمبەرەکەی بەجێ گەیاند .. ئەوانی تریش خوبەیب و زەید هەوڵیان دا خۆیان بکەنەوە ، بەڵام زۆربە توندی بەسترا بوونەوە ..

بە پێشە خۆیان دان ، وبردیانن بۆ مەکە ، بۆ ئەوەی بیان فرۆشنە گاورەکان ..

ناوی (خوبەیب) لە بانگەهێشتن درا .. ئەوەی حارث کوڕی عامر (کوژراوی بەدر ئەم ناوەیان بەیاد هاتەوە، چونکە زۆر بە چاکی ئەم ناوەیان لە بەر کرد بوو ، ئنجا رق وکینە لە دلیان دەستی پێ کرد ...
پەلەیان کرد بۆ کرینی ... بەتایبەتی ئەوانەی لە شەڕی بەدر باوک وخزم و کەس و کاریان لە دەست دابوو بەلام لە کۆتایی دا ، بڕیاریان دا تۆڵەی دلیان نەک هەر لە خوبەیب ، بەڵکو لە جیاتی هەموو مسولمانان لە خوبەیب بکەنەوە ...!! چینێکی تر لە گاورەکان دەستیان درێژ کرد بۆ (زید کوڕی دثینە) و سزاو ئازارێکی یەکجار زۆریان دا .... گیانی پاکی زەید لە شەقەی بالی داو چارەنووسی بەرەو خوای پەروەردگار بەرێ کەوت ..
ئینجا هاتن بۆ لای خوا پەرستی دەروون بەهێزو نەفس پاک ، کەوا ئارامی خوای بۆ هاتووەو هیچ باکی بە ئازارو ئەشکەنجە نیە .... خوای گەورە لەگەلیتی و ئەویش لەگەل خوایە .. هێزی خوای لەگەلەو لەم کاتانەدا هەموو دل و دەروونی بەم ئارامیە داپۆشیبوو ....!
رۆژێک کچێکی (الحارث) هاتە لای و ، ئەو کاتە خوبەیب لە مالی ئەوان دیل بوو ، یەکسەر بە پەلە گەڕاوە لای خەلکەکەو بانگی کردن بۆ ئەوەی ئەو شتە سەیروسەمەرە ببینن :- [ سوێند بە خوا بینیم هێشویەک ترێی گەورەی لەلا بوو ، لیی دەخوارد ... بە زنجیریش بەسترا بۆوە کەلەو کاتە لە هەموو مەککەدا بەرویومی یەک دانە ترێ نەبوو ....
(گومان تەنها بۆ ئەوە دەبەم ئەمە رۆزیەک بێ لەلایەن خوا ئەم رزقە بە خوبەیب درابێ) بەلێ ... ئەمە رۆزیەکە خوا دەداتە بەندە صالحەکانی ، هەروەک چۆن دای بەمریم کچی عیمران کاتی خۆی ...
[کلما دخل علیها زکریا المحراب وجد عندها رزقا قال : یا مریم انی لك هذا ...؟؟ قالت : هو من عند الله ، ان الله یرزق من یشاء بغیر حساب] ..!!
گاورەکان دەنگ وباسی شەهید بوونی هاوڕێکەی، کە (زید کوڕی دثینە) بوو بۆ (خوبەیب) یان برد (خوا لیی رازی بێت) ... وا گومانیان دەبرد بەم جۆرە شەڕ لەگەل دەروونی خوبەیب دەکەن ، بەمردن دەیترسێنن و ، بەلام نەیاندەزانی خوای بە بەزەیی ئارام و رەحمەتی خۆی بۆ دابەزاندووە و گوێی لەمان نیە ... ئنجا هاتن مەزادیان لەسەر ئیمانەکەی کرد ، مزگێنیان دایێ بەرزگارکردن ئەگەر کوفر بە محمد بکات ،

هەروا بەو خوایەی بڕوای پێ هێناوە .. بەڵام ئەوان چۆن تیر بهاوێژن بۆ خۆر ، بەم جۆرە مامەڵەیان لەگەڵ دەکرد ... بەڵێ بڕوای خوبەیب وەک هێزی خۆر بوو ، لە دووری و ئاگرو ڕووناکی ...

هەر کەسێک نیازی بایە ڕووناکی لێ وەردەگرت ، یان بیوستبایە خۆی پێ گەرم دەکردەوە ... بەڵام ئەوەی لێی نزیک بایەوە ونیازی خراپەی هەبوایە ، دەیسوتاندو لە ناوی دەبرد ..

بەڵێ پاش ئەوەی لێی نائومێد بوون ، ئەم قارەمانەیان بەپێشە خۆدا بۆ شەهیدکردنی ، بردیان بۆ شوێنێک پێیان دەگووت (التنعیم) .

پێش ئەوەی شەهید بکرێ داوای ڕوخسەتی دوورکات نوێژی لێ کردن ، ئەوانیش ڕێگایان دا گومانیان بۆ ئەوە برد وایان زانی ئێستا لەگەڵ خۆی دەدوێ ئیعلانی کوفر دەکا بەخواو بەپێغەمبەرو بە ئایینەکەی ...!!

خوبەیب دوو ڕکات نوێژی کرد بە خشوع وملکەچی لە گیانی شیرینی ئیمان هەڵدەقولاو ، ئەگەر لە بەر گومانی خراپی ئەوان نەبوایە بەردەوام دەبوو لەنوێژەکەیدا بۆیە ئاوڕی لە خوێن ڕێژەکەی داوەو پێی گووت: [ سوێند بەخوا ، ئەگەر واتان نەزانیبایە من لە مردن دەترسێم ، زیاتر نوێژەکەم درێژ دەکردەوە ...! پاشان دەستی بەرەو ئاسمان بەرزکردەوەو فەرمووی : [ پەروەردگارا، هەموویان دەست نیشان بکەو، یەک یەک بیان کوژە] ..

پاشان ڕووی تێ کردن وئەم هەڵبەستەی گووت :

ولست ابالي حين اقتل مسلما    على اي جنب كان في الله مصرعي

وذلك في ذات الاله وان يشا    يبارك على اوصال شلو ممزع

لەوانەیە بۆ یەکەم جار لە مێژووی عەرەب ڕووی دابێ پیاوێکی وا لەسێدارە بدەن و بیکوژن ...

لەسەر لقەکانی دار خورمایەکە سێدارەکی گەورەیان دروست کردو پاشان خوبەیبیان لەسەر چەسپ کرد لەگەڵ هەردوو دەست وپێی ... گاورەکان دەورەیان دا بەکەیف و خۆشی و ... ڕم هاوێژەکانیش ڕمەکانیان بە ئاراستەی ئەو ڕاگرت ...

ئەم کارە دڕندانەیان هەموو بەرامبەر قارەمانێکی لە سێدارەدراو کردو کە مەبەستیان بوو .. بەڵام خوبەیب چاوی نەنوقاند ، پاش ئەوەی ئەم ئارامیەی لەلایەن خوا کەوتە ناو دڵی ، ڕم هاوێژەکان دەستیان بە ڕم هاوێشتن کردو ، شمشێرەکانیش

لەشیان لەت لەت دەکرد لێرەدا یەکێک لە گەورەکانی قورەیش لە خوبەیب نزیک بۆوەو ، پێی گووت :ـ
[اتحب ان محمدا مكانك ، وانت سليم معافي في اهلك] ..؟؟
واتە : حەز ناکەیت موحەممەد لەجێگای تۆبێ و ، وە تۆ سەلامەت و بەکەیف بیت لەناو کەس وکارت ؟
لێرەدا خوبەیب وەکو بروسک دەنگی هات و ، هاواری کردە سەر جەلادەکەو فەرمووی :
[والله ما احب اني في اهلي وولدي ، معي عافية الدنيا ونعيمها ، ويصاب رسول الله بشوكة] ..
واتە : سوێند بەخوا من حەز ناکەم لە ناو کەس و کارو منداڵم بم ، لەخۆشی دونیا ئارەزووەکانی دابم ، پێغەمبەری خواش درکێکی لە لەشی رابچێت ...
هەمان ووشەی مەزن وپیرۆز کەوا هاوڕێکەی (زید کوڕی دثینە) بە ڕووی ئەو گاورانەی دادا کە شەهیدیان کرد ، هەر هەمان ووشەش خوبەیب ئاڕاستەی بکوژەکانی خۆی کرد ... هەر ئەوە بوو وای لە ابا سفیان کرد (کە هێشتا مسوڵمان نەبوو بوو) کە وا هەردوو ناو لەپی دەستی لەیەک بداو بڵێ :ـ [والله ، ما رأيت احداً يحب احداً كما يحب اصحاب محمد محمداً] ...!!!
واتە : سوێند بە خوا ، نەم دیوە یەکێک یەکێکی خۆش بوێ ، هەروەک هاوەڵەکانی موحەممەد موحەممەدیان خۆش دەوێت ...!!!!!
ئەم وشانەی خوبەیب وای لە ڕم هاوێژو شمشێر بەدەستەکان کرد نائومێد بن لە هەڵگێڕانەوەی خوبەیب ، لەبەر ئەوە زۆر بە دڕندانە وەکو گورگی هار کەوتنە سەر لاشەی پیرۆزی و لەت لەتیان کرد ...
بەڵێ لەگەڵ ئەم دیمەنەدا باڵندەو قەل و هەڵۆکان لەسەر سەری خوبەیب دەسوڕانەوە ، دەتگووت چاوەڕێی جەلاددەکان دەکەن ، بۆ ئەوەی بڕۆن وبکەونە سەر لاشەی خوبەیب کەوا وەجبەیەکی خواردنی چاک بوو بۆیان ... بەڵام زۆری پێ نەچوو باڵندەکان لە تاقی ئاسماندا لەیەک نزیک بوونەوەو دەتگووت بەزمانی حاڵی باڵندە گفتوگۆیان لەگەڵ یەک کردو ، لە ناکاو هەریەکەکیان بۆ لایەک پەرت وبڵاو بوونەوە ... هەتا ئەندازەی چاو لەیەکتر دوور کەوتنەوە ...
هەروەک بڵێی بە هەستی خۆیان بۆنی پیاوێکی صالح و خواپەرست بکەن ، کەوا بەسێدارە بەستراوەتەوە ، نەیانتوانی لێی نزیک بینەوە و بەخراپە دەستی بۆ ببەن !!

بەم جۆرە تەرمی پیرۆزی خوبەیب بەسێدارە مایەوە و .. کۆمەڵێک لە قورەیشەکان پاسەوانیان لێ کرد بە شمشێرو ڕمەکانیان ....
کاتێک خوبەیب بەرزکرایەوە بۆ سەر لقی دار خورمایە کەو دەیانویست لێی ببەستنەوەو توندی بکەن ... کە هێشتا گیانی پیرۆزی نەگەیشتبووە بارەگای خوا .
لەم کاتەدا ، ڕووی لە ئاسمان کردو دوعای بەرامبەر خوای مەزن کرد ، فەرموی :ـ
[اللهم انا قد بلغنا رسالة رسولك ، فبلغه الغداة ما يصنع بنا]
واتە : [ پەروەرگارا ، ئێمە بەڕاستی پەیامی پێغەمبەرەکەتمان گەیاندو ، هەر ئەمڕۆ بە پێغەمبەرەکەت ڕابگەیەنە کەوا چیمان پێ دەکەن .. !! خوای گەورە دوعاکەی وەرگرت ... کاتێک پێغەمبەر لە مەدینە بوو وا هەستی کرد کەوا هەندێک لە هاوەڵەکانی لە ناخۆشی دان ، بینی وا تەرمی یەکێکیان هەڵواسراوە ... یەکسەر بانگی (میقدادی کوڕی عەمرو زوبەیری کوڕی عەوام)ی کرد ، سواری ئەسپەکانیان بوون و بەرەو شوێنی هەڵواسینی خوبەیب چوون .. تاکو خوای گەورە گەیاندنی بە شوێنی هەڵواسینەکە ، تەرمی هاوەڵەکەیان هێنا خوارەوە کەوا شوێنێک لە زەوی چاوەڕێی ئەم تەرمە پیرۆزەی دەکرد بۆ ئەوەی هەڵیبگرێ وببێتە شەرەف بۆی ...
سەلامی خوا لە (عاصم کوڕی ثابت) و ... سەلامی خوا لە (خوبەیبی کوڕی عەدی) و .... سەلامی خوا لە (زەیدی کوڕی دثنە) و ... سەلامی خوا لە هەر (حەوت هاوەڵەکانیان) و ... سەلامی خوا لە هەموو ئەو شەهیدانەی ئیسلام کەوا لەسەر بەرنامەو ڕێبازی پێغەمبەرەکەیان محمد گیانیان بەخت دەکەن .

١١

# سەعدی کوڕی وقاص

## شێرێك لە لانەکەیدا

﴿١١﴾

## سەعدی کوڕی وقاص

## شێرێك لە لانەکەیدا

ئەو پەلامارە یەک لە دوای یەکانەی کە سوپای فارسی ستەمکار دەیکردە سەر مسوڵمانان دڵی گەورەی مسوڵمانان (عومەری کوڕی خەتاب) ی خەمبارکردو ... بەتایبەتی کەوا لە جەنگی (جسر) لەیەک ڕۆژدا مسوڵمانان چوار هەزار شەهیدیان کرد بە قوربانی ... هەروەها پاش ئەوەی خەڵکی عێراق ئەم بەڵێن و پەیمانانەی کە دایبویان شکاندیان ... گەورەی مسوڵمانان بڕیاری دا سوپایەک بنێری بۆ سەریان و خۆی سەرکردایەتی بکات..

لەگەڵ هاوەڵەکانی بەڕێ کەوتن و (علي کوڕی ابی طالب) ی لە شوێنی خۆی دانا (خوالیی ڕازی بێت).. بەڵام هێشتا مەدینەی بەجێ نەهێشتبوو ، هەندێک لە هاوەڵەکانی بینی دەگەڕانەوە ، پێویست بوو بۆ ئەم شتە گرنگە ، یەکێکی تر دابنێت بێجگە لە خۆی ... وە ئەم بیروڕایەش (عبدالرحمن کوڕی عەوف) دایهێنا ، بۆ پاراستنی ڕۆحی سەرۆکی مسوڵمانان ، کەوا ئیسلام لەم ڕۆژگارەدا پێویستی پێیەتی

عومەر (خ .ر) فەرمانی دا مسوڵمانان کۆببنەوە بۆ ڕاوێژکردن ، بانگیان دا: الصلاة جامعة .. عەلی کوڕی ابی طالب (خ .ر) بانگی کردن / .. ئەوە بوو گەورەی مسوڵمانان لەگەڵ چەند خەڵکێکی مەدینە گەڕانەوە ... بیروڕایەکان کۆتاییان پێ هات بە کۆتابڕیاری (عبدالرحمن کوڕی عوف) ، هەموویان بڕیاریان دا عومەر بگەڕێتەوە بۆ مەدینەو ، پێشەوایەک هەڵبژێرن لە بڕواداران بۆ ئەم لەشکرە ... گەورەی موسڵمانان لەسەر ئەم بیروڕایەی هاتە خوارەوە ، گەڕاوە بۆ مەدینەو پرسیاری کرد لە هاوەڵەکانی:

- کێ شیاوی ئەوەیە بینێرین بۆ عێراق ... ؟؟

هەندێک بێ دەنگ بوون و بیریان کردەوە ...

پاشان عبدالرحمن کوڕی عوف گوتی : بەڕاستی دۆزیمەوە ...!!

عومەر گوتی : ئەمە کێیە ؟

عبدالرحمن گوتی : [شێرێک لەناو لانەکەیدا ... سەعدی کوڕی مالکی زوهری ...]

موسڵمانان ئەم ناوەیان پەسەند کرد ، گەورەی موسڵمانان ناردیە دوو سەعدی کوڕی مالکی زوهری. کەوا سەعدی کوڕی آبی وەقاص بوو. ئیمارەی عێراق و ، سەرکردایەتی سووپای دا دەست ...

جا با بزانین ئایا ئەم شێرە لە لانەکەیدا کێیە ... ؟

ئەوە کێیە کە دەهات بۆ لای پێغەمبەر کاتێ لەناو صەحابیەکان بوو سڵاوی دەکردو پێغەمبەر ﷺ قسەی خۆشی لەگەڵ دەکردوو دەیفەرموو: [ ئەوە خاڵی منە .. با یەکێک لە ئێوە خاڵی خۆی بە من نیشان بدات] بەڵێ (سەعدی کوڕی وقاص)ە .. باپیری ( أهیب کوڕی مناف) .. مامی دایکی مسوڵمانان دایکی پێغەمبەر ﷺ (ئامینە) یە ..

لە تەمەنی حەڤدە ساڵان مسوڵمان بوو .. لە ماوەیەکی کەم بوو بە موسڵمان ...، هەروەک باسی خۆی دەکاو دەڵێت : (بەرۆژێک دا ڕۆیشتم .. من سێیەکی ئیسلام بووم ) ... واتە یەکێک بوو لەو سێ کەسەی بەخێرایی هاتن بۆ ناو ئیسلام ...

لە سەرەتای دەستپێکردنی بوونی محمد بە پێغەمبەر ، باسی تەنهایی خوای گەورەی دەکردو باسی ئەو ئایینە نوێیەی بۆ خەڵک دەکرد ، پێش ئەوەی ماڵی ( أرقم کوڕی أبی أرقم) ببێتە جێگای حەشاری بڕواداران ... سەعدی کوڕی وەقاص دەستی پیرۆزی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ درێژکردو پەیمانی لەگەڵ بەستا ...

مێژوو وا بۆمان باس دەکات کە (ابوبکر) خوا لیی ڕازی بێت .. بووە هۆی موسڵمان بوونی سەعدو لەسەر دەستی ئەو ئیسلامی وەرگرت .. هەروەها هەر لەم ڕۆژانەش بوو .. عثمان کوری عفان وزبیری کوڕی عوام و ، عبدالرحمن کوڕی عوف و طلحە ی کوڕی عبیداللە هاتنە ناو ئیسلام .. هەروەها تەنها بەم دووشتە مەزنەش شانازی پێوە دەکرد :

یەکەمیان : یەکەم کەس بوو تیری هاوێشت لە ڕێگای خواو ، وەیەکەم کەسیش بوو تیریان بۆ هاوێشتەوە..

دووەمیان : سەعد تەنها کەسێک بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دایک و باوکی بە قوربان بکات و کەوا لە جەنگی ئوحد پێی فەرمو .. [أرم سعد ..فداك أبي وأمي] .. تیر بهاوێژە سەعد .. دایک وباوکم بەقوربانت بێت .. بەڵێ .. هەموو کاتێک ئەم دوو نیعمەتە گەورەی دەگوتەوە ، سوپاسی خوای لەسەر دەکردو دەیفەرموو :[واللە .. من یەکەم پیاوێکم لەناو عەرەب تیرم هاوێشت لە پێناوی خوادا] .. ئیمامی

عەلی خوا لی‌ی ڕازی بێت دەفەرمووێت :[من گوێم لی‌نەبووە پێغەمبەری خوا ﷺ دایک و باوکی بەقوربانی کەس بکات تەنها سەعد نەبێت .. گوێم لێ بوو دەیفەرموو ڕۆژی ئوحد: [أرم سعد ..فداك أبي وأمي] ..

سەعد یەکێکە لە ئازاترین سوارچاکانی عەرەب و مسولمانان، خاوەنی دووچەک بوو کەبریتی بوو لەرمەکەی ودوعاکانی ..ئەگەر تیری بهاوێشتایە شوێنی خۆی دەگرت ، ئەگەر دوعاشی بکردایە قبول دەبوو ..

هەروەک ئەصحابەکان ئەو دوعایەی پێغەمبەریان دەگووتەوە کەبۆ سەعدی کردبوو .. ئەویش ئەم دوعایە بوو [اللهم سدد رميته ، وأجب دعوته] .. بەم جۆرە لە نێوان هاوڕێکانی وا ناسرابوو ، کەوا دوعاکانی وەک شمشێری بن بڕبوون ، بەلام لەگەڵ ئەوەش دوعای لەکەس نەدەکرد بەڵکو عەوارەی خوای دەکرد ..

وە لەسەر ئەمە (عامری کوڕی سەعد) بۆمان دەگێڕێتەوەو دەڵێت :

[سەعد پیاوێک دەبینی جوێن بە عەلی و، طلحە و ، زبێر دەدات ، ئەویش پی‌ی دەڵێت کەوا دەمی خۆی بگرێت ، بەلام پیاوەکە واز ناهێنێت ، .. سەعدیش پی‌ی گوت واز بێنە دەنا دوایی دوعات لی دەکەم ، پیاوەکە پی‌ی گوت : دەبینم دەمترسێنیت ، هەروەک پێغەمبەر بیت .. (سەعد دەڕوا و دەست نوێژێک دەشواو دوو ڕکات نوێژ دەکات ، پاشان دەست بڵند دەکاو دەڵێت: خوایە تۆ دەزانیت ئەم پیاوە جوێن بە کەسانێک دەدات، بێجگە لە چاکی هیچی تریان لی نابینم ، خوایە عەوارەی تۆی دەکەم، خوایە بیکەیتە پەندو عیبرەت..)

بەلی ئەوەبوو ماوەیەکی زۆری نەبرد ، ڕۆژێک حوشترێک لە ماڵێک دەرچوو وبەرەلابوو نەگراوە تاکو ڕووی لە قەلەبالغەیەک کرد هەروەک ئەوەی لەشتێک بگەڕێت۔ پاشان ڕووی لەم پیاوە جوێن فرۆشە کردو لەبن دەست وپی‌ی خۆی نا ، تاسەرئنجام کوشتی ..

ئەم دیاردەیە ، پاکی دەروونی سەعد بەدیار دەخات لەگەڵ گومانە ڕاستەکانی وقوڵایی دلسۆزی .. سەعد هەموو کاتێک پشتی دەبەست بە پارووی حەلال بۆ بەهێز کردنی تەقوای ،یەک درهەم ئەگەر بیزانیانە گومانی حەرامی هەیە قبولی نەدەکرد ..

لەگەڵ ئەوەشدا دەوڵەمەنترین کەس بوو لەناو مسولمانان ، ئەو ڕۆژەی ماڵ ئاوایی لەدونیا کرد سامانێکی زۆر کەمی لەپاش بەجی‌ما .. چونکە سەعد خوا لی‌ی ڕازی بێت مامۆستا بوو لە بەخشین ، لەحەجی ماڵ ئاوایی ، لەگەڵ پێغەمبەری خوا

ﷺ بوو ، تووشی نەخۆشی بوو ، پێغەمبەر ﷺ سەردانی کرد ، سەعد پرسیاری لێ کردو گووتی :
ئەی پێغەمبەری خوا ، من خاوەن ماڵم ، کەس میراتم ناگرێ تەنها کچێک نەبێ ، دووسێ یەکی ماڵم ببەخشم .. ؟
پێغەمبەری خوا فەرمووی : نەخێر ..
پێم گووت :نیوەی ماڵم .. ؟
پێغەمبەر فەرمووی :نەخێر ..
پێم گووت :ـ سێ یەکی ..
پێغەمبەر ﷺ فەرمووی :بەڵێ ، سێ یەکیش زۆرە .. تۆ ئەگەر میراتگرەکان بە دەوڵەمەندی بەجێ بهێڵی ، باشترە لەوەی فەقیر بن و چاویان لە دەستی خەڵک بێت ، تۆ هەر ماڵێک ببەخشی لەرێگای خوا پاداشت دەدرێیتەوە ، هەتا ئەو پارووەی لەدەمی خێزانەکەت دەنێی ]
بەڵام پاشان سەعد خوای گەورە چەند کوڕێکی پێ بەخشی ..
سەعد لە ترسی خوا زۆر دەگریا .. کاتێک بیبینایە پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگاری و ووتار بۆ خەڵک دەدا ، فرمێسک لە چاوانی دەهاتە خوارەوە تا ڕیشی تەڕدەکرد ..
ڕۆژێک پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ صەحابیەکانی دانیشبوو ،ڕوانیە دوور تۆزێک ڕاما ، پاشان تەماشای ڕووی صەحابیەکانی کردوو پێ ی گووتن:ـ
[ئێستا پیاوێکتان لێ بەدیار دەکەوێت ، ئەهلی بەهەشتە ] . ئەوەبوو صەحابیەکانی هەموو چاوەڕوانیان دەکرد ، بزانن ئەو بەختیارو چارەنوسی خێرە کێ یە پاش ماوەیەکی کەم .. سەعدی کوڕی أبی وقاص لێیان بەدیار کەوت ..
پاشان (عبداللەی کوڕی عەمری کوڕی عاص) خوا لێ ی ڕازی بێت بەنهێنی پرسیاری لە سەعد کردو ناچاری کرد ئەو نهێنی یە بدرکێنێ چ شتێکەو چ کردارێکە ئەوەها لەخوا نزیک بوویتەوەو بۆتە شایەنی ئەم پلەو پایە سەعد پێ ی گووت:
[لاشیء أكثر مما نعمل جميعا" ونعبد .. غير أني لا أحمل لأحد من المسلمين ضغنا" ولا سوءا"] ..
واتە :[ هیچ شتێکی زیاد ناکەم لەکردەوەکانی ئێوە وەئەوەی ئێوە دەیپەرستن .. بێجگە لەوەی هیچ حیقدو خراپیەک لەدڵی خۆم ناهێڵمەوە بەرامبەر هیچ مسوڵمانێک ] ..

بەڵێ ئەوەیە (شێری لەناو لانە) هەروەک عبدالرحمن کوڕی عوف ناوی لێنا عومەری کوڕی خەتاب هەڵیبژارد چونکە لە خەڵک جیا دەکرایەوە بەم سیفاتانە :
دوعای قەبول بوو ، ئەگەر داوای سەرکەوتنی لەلای خوا بکردایە .. ماڵی حەلال بوو و ، زمان پاک بوو و ، بەوویژدان بوو . یەکێک بوو لە ئەهلی بەهەشت ، هەروەک پێغەمبەر ﷺ مزگێنی پێدابوو: هەروەها سوارچاکی ڕۆژی بەدرو ، ڕۆژی ئوحدو ، سوارچاکی هەموو شەڕەکانی ئیسلام بوو لەگەڵ پێغەمبەر یەکێکی تر کەئەوا (عمری) خەلیفەی مسوڵمانان ، لە یادی نەدەچوو مەسەلەی نێوان سەعدو دایکی بوو ، ئەو کاتەی سەعد بوو بە مسوڵمان و بەدوای ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ کەوت ... ئەو کاتە هەموو هەوڵ و تەقەلایەکی دایکی بێ سود بوو بۆ لەڕێگا لادان و هەڵگێڕانەوەی سەعد لەڕێگای خوا .. دایکی پەنای بردە ڕێگایەک کەس گومانی لەوەنەبوو ، کەوا گیانی سەعد دەڕوخێنێ دەیگێڕنەوە بۆبت پەرستنی دایک و باوک و خێڵەکەی ..
ئەوەبوو دایکی بڕیاری مان گرتنی دا لەسەر خواردن و خواردنەوە ، هەتا سەعد بگێڕێتەوە بۆ ئایینی باب و باپیرانی ومیللەتەکەی ، ئەوە بوو بەردەوام بوو لەسەر ئەم نەخشە مردیهێنەرە ،خواردن و خواردنەوەی لە خۆحەرام کرد تا نزیکی مردن بۆوە ..
سەعد گرنگی بەم شتە نەدا ، لەبەر ئەوەی ئیمانەکەی ناگۆڕێتەوە بە هیچ شتێک لەسەر ڕووی زەوی نە بەپارە نە بەمنصب وپلەو پایە ، هەتا ئەو شتە ڕوحی دایکە خۆشەویستەکەشی بێت ..!!
کاتێک دایکی نزیکی مردن بۆوە ، هەندێک لە کەس و کاری سەعدیان بردە لای دایکی بۆ ئەوەی لە کۆتایی ژیانی ماڵ ئاوایی لێ بکات ، بۆ ئەوەی سۆزی بۆ دایکی هەڵسێت وبیبینێ لەکاتی مردن ..!!
بەڕاستی ئەم دیمەنە بەردی دەتاواندەوە ، بەڵام ئیمان و براوایەکەی لەسەرەوەی هەموو ئاسن و بەردێک بوو ، ئەوەبوو لەدایکی نزیک بۆوەو ، بانگی کرد بۆ ئەوەی گوێی لێ بێت :
[دەزانی سوێند بەخوا ئەی دایکە ، .. ئەگەر سەد گیانت هەبێ ، یەک یەک ئەم گیانانەت دەربچێ ، بزانە واز لەم ئایینە ناهێنم بۆ هیچ شتێک .. ئەگەر حەز دەکەیت خواردن بخۆیت یان نەخۆیت ] ..!!!

بەلێ ئەوەبوو دایکی وازی لەم مان گرتنە هێنا .. نیگا بۆ پێغەمبەر ﷺ هاتە خوارەوەو کەپشتی هەڵوێستی سەعدی گرت ، کەدەفەرمووێت : [وان جاهداك على ان تشرك بي ماليس لك به علم فلا تطعهما ].

بەم جۆرە ئەمیری بڕواداران ئالاّی قادسیە دەداتە دەست سەعد ، بۆ ئەوەی شەڕ لەگەڵ زیاتر لەسەد هەزار جەنگاوەری ڕاهێنراو بۆ شەڕ بکات ، کەوا پڕچەک کراون بەگەورەترین چەکی ئەم کاتەو زیرەکترین وشارەزاترین کەس سەرکردایەتیان دەکات لەو ڕۆژەدا ..!!

بەلێ سەعد بە سی هەزار موجاهید دەیەوێت بەرەنگاری ئەم هەموو لەشکرە ببێتەوە .. کەگەورەترین چەکی دەستیان ڕم بوو .. بەلێ تەنها ڕم .. بەلاّم دڵەکانیان جۆش کراوە بەم ئایینە نوێیە ، کە پڕە لە ئیمان و غیرەت وپەرۆشی یەکی یەکجار زۆر بۆ مردن و ، شەهادەت ..!!

هەردوو لە شکرەکە نزیکە پێک بگەن ..

سەعد لێپرسراوی مەکتەبی سەربازی چاوەڕێی ئامۆژگاری یەکانی و بڕیارەکانی سەرکردایەتی بزوتنەوەی ئیسلامی دەکات کە پایتەختەکەی لەشاری مەدینەیە .. ئەمەش پەیامێکە لەلایەن عومەری کوڕی خەتاب ئاڕاستەی سەعد دەکرێ. پێش هەموو شتێ دڵ و دەروونی سەعد پاک دەکاتەوە بە چەند ووشەیەکی ڕوناکی بەر دەیفەرموو [ئەی سەعدی کوڕی وەهیب ...نەکەی مەغرور ببیت ، بڵێیت: من خاڵی پێغەمبەرم و صەحابەی ئەوم ، لە نێوان خواو هیچ کەسێک نەسەب نیە تەنها بەخواپەرستی نەبێ ، خەڵکی گەورەو بچووک لەلایەن خوا وەکو یەکە .. (الله) خوای ئەوانە ، ئەوانیش بەندەی ئەوەن ...گەورە دەکرێن بەکردەوەی چاک و ، تەنها بە خواپەرستی لە خوا نزیک دەبنەوە ، تەماشا بکەن پێغەمبەری خواﷺ تاکو لەناومان بوو ولێمان جودا بۆوە دەستی بە چی گرتبوو ، تۆش ئەوە بگرە ، پاشان لەدامێنی نامەکەدا بەسەعد دەڵێت :

[ هەموو دەنگ وباسی خۆتانم بۆ ڕەوانە بکە ، چۆن دادەبەزن ؟ وەدوژمن لەکوێی ئێوەیە ؟ .. بۆم بنوسەهەروەک من تەماشای ئێوە بکەم ] ..!!

بەم جۆرە سەعد نامە دەنووسێ بۆ ئەمیری بڕواداران هەموو شتێکی بۆ باس دەکات ، هەتاکو شوێن وجێگای هەموو سەربازەکانی بۆ ڕوون دەکاتەوە : سەعد سوپاکەی دەچێت بۆ قادسیە ، فارسەکان لەشکر ومیللەتیان هێناوە ، هیچ کاتێک

بەم جۆرە کۆنەبوونەوە ، سەرکردەی فارسەکان نازاترین پیاویان کەوا (ڕۆستەم) سەرکردایەتی لەشکرەکەیان دەکات . .
لەم کاتانەدا ئەمیری بڕواداران عومەری کوری خەتاب بۆ سەعد دەنوسێ و دەڵێت :
[ئەوەی گوێت لی دەبێ لەوان ووره‌ت پێ بەرنەدا ، پشت وپەنات بەخوا بێ ، چەند پیاوێکی خاوەن بیروهۆش و بەغیرەت بنێرنە لای فارسەکان و داوایان لی بکەن بۆلای خواو ڕۆژانەش لەدەنگ و باس ئاگادارم بکەنەوە سەعد دەگەڕێتەوەو بۆ ئەمیری بڕواداران دەنوسی و دەڵێت :
[ ڕۆستەم سەربازگەی لە (ساباط) داناوە ، وا ئێستاکە فیل و ئەسپەکانیان لە ئامادە باشی دان بەرامبەرمان] .
سەعد پێشەواو سەرکردەیەکی زیرەکەو پاڵەوانی شەڕو غەزایەکانە ، هەروەک سەربازێک بەشداری شەڕەکە دەکا ، شانازی بەهێزو پلەو پایە ناکات هەنگاو بەهەنگاو هەواڵی جەنگ بەڕێ دەکا بۆ ئەمیری بڕواداران و ڕاوێژو کۆبوونەوە لەگەڵ ئەندامانی لەشکردەکا . . ئەو سەعدە تەنها خۆی بڕیار ناداو بەڵکو ڕاوێژ لەگەڵ ئەوانە دەکات کەوا لەکاروباری جەنگ دەزانن و باشترین و بەتەقواترین ئەصحابەی پێغەمبەرن ﷺ . .
سەعد بڕیاری (عمری کوری خەتاب) (خ . ل) ڕادەپەڕێنێ و چەند صەحابیەک ڕەوانەی لای ڕۆستەم دەکات ، داوایان لی دەکات بۆ لای خواو مسوڵمان بوون . . پاش گفت وگۆیەکی درێژ لە نێوان لێپرسراوەکانی فارس ، نێردراوی سەعد بە ڕۆستەم دەڵێت :
[خوا ئێمەی هەڵبژاردوو ، بۆ دەرهێنانی ئەو بەندانەی حەزی لی دەکات لەبت پەرستی بۆ یەکتا پەرستی . . وەلە تەسکی دونیا بۆ فرەوانی دونیا ، وەلەستەمی فەرمانڕەواو ستەمکارەکان بۆ دادوەری ئیسلام . .
(هەر کەسێک ئەوەمان لی قەبول بکا ، قەبوڵی دەکەین ، وەهەرکەسێکیش شەڕمان لەگەڵ بکات شەڕی لەگەڵ دەکەین ، هەتا بەڵێنی خوابەجێ دەگەیەنین . .]
ڕۆستەم پێی دەڵێت : ئەو بەڵێنە چی‌یە خوا بە ئێوەی داوە . . ؟
صەحابیەکە وەڵامی دەداتەوە :ـ [الجنة لشهدائنا ، والظفر لاحيائنا] .
(بەهەشت بۆ شەهیدەکانمان و . .سەرکەوتن بۆ زیندووەکانمان) .

نوێنەرەکە دەگەڕێتەوە بۆ لای سەرکردەی مسوڵمانان سەعد ، خەبەری شەڕی دەداتێ .. بەڵام سعد ئاخ و مەخابن ، لەم کاتەدا سەعد نەخۆشی ڕووی تێدەکاو لەشی گران دەبێت و بێ هێز دەبێت ، قونێرەکان لەشی هەموو دادەگرێت ، ناتوانێت دابنیشێت وسواری ئەسپەکەی ببێت ، کەلەو کاتانەدا شەڕێکی یەکجار گەورە ڕووی تێ دەکات ...

ئا لەم کاتەدا (شێر لە لانە) دەوەستێ بەرامبەر لەشکرەکەی و ووتار دەداو ، ئەم ئایەتەیان بۆ دەخوێندەوە: [بسم الله الرحمن الرحيم ولقد كتبنا في الزبور من بعد الذكر ان الأرض يرثها عبادي الصالحون ] ..

پاش تەواو بوونی ووتارەکەی ، نوێژی نیوەڕۆی بەسوپاکە کردو ، پاشان پێشوازی لە لەشکرەکەی کرد بە چوار تەکبیر: الله اكبر .. الله اكبر .. الله اكبر .. الله اكبر ..
دەنگی (الله أكبر) لەم شوێنە دەنگی دایەوە ، دەستی پیرۆزی درێژکرد بۆ دوژمن و ، هاواری کردە سەرموجاهیدەکان: بڕۆن بەبەرەکەتی خوا ...

کەپرێکیان بۆ دروست کردبوو لەناو مەیدانی جەنگ .. لەبەر نەخۆشی دانیشتبوو لەبن کەپرەکەو لە پەنجەرەیەک سەرپەرشتی جەنگەکەی دەکردو ، بالیفێکی بەبن سنگی خۆی وەنابوو .. هەر پەلامارێکی فارسەکان کەوا پەلاماری ئەم شوێنەی سەعدیان دەدا یان دەکوژران و یان بەدیل دەگیران ، سەعد ئاگای لە ئێش و ئازاری لەشی نەمابوو ، لەم دەلاقە تەکبیری لی دەداو هاواری دەکرد ، فەرمانی پێ یان دەدا : لای ڕاست بگرن ، ئەم بۆشاییانەی لای چەپ پڕ بکەنەوە ،لای پێشت ئەی موغەیرە ، دواوەت ئەی جەریر ، لی‌یان دە ئەی نوعمان پەلاماریان دە ئەی أشعث .. تۆش ئەی قەعقاع ، بۆ پێشەوە بڕۆن ئەی ئەصحەبەکانی محمد ﷺ ...!!

هاوارو دەنگەکەی هێزێکی بێ وێنەی دا بە موجاهیدەکان ، تا هەر موجاهیدێک بوو بە لەشکرێک .. جەنگاوەرەکانی فارس وەکو مێش هەڵدەوەرین .. هەڵوەرانی بت پەرستان وئاگر پەرستان .. پاش ماوەیەک لەشکرە شکاوەکەیان وورەیان بەردا کە بینیان سەرکردەکەیان کوژراو لەشکرەکەیان شکا .. مسوڵمانان کەوتنە دوایان تاکو (نهاوند) .. پاشان(مدائن) پاشان تەخت وعەرش و تاجەکەی کیسرا ، کەوتە بەردەستی مسوڵمانان بەغەنیمەت .. لەناوچەی (المدائن) سەعد تووشی بەڵای گەورە هات ..

هەروەها ڕووداوی (المدائن) پاش ڕووداوی (قادسیە) هات بەدوو ساڵ لەم ماوەیەدا پێکدادانی بەردەوام هەبوولە نێوان فارسەکان و مسوڵمانان ، هەموو پاشماوەکانی لەشکری فارسی کۆبیبونەوە لە (مدائن) ، ئامادە بوون بۆ ئاخیر هەڵوێست وهەوڵدانیان ...

سەعد زانی کات لە سوودی دوژمنەکانیەتی ، بڕیاریدا بۆئاخیر جار کۆتاییان پێ بهێنێ بەلاّم ئەم کارە زۆری دەوێ چونکە لەنێوان مدائن وئەوان ڕووباری دیجلە هەیەو ئاو کاتی هەستانیەتی ..

بەلاّم ئیمانی سەعدو ئەخشەدانانی ، ئەم شتەی کە مرۆڤ بیری بۆ ناچێ بەسەری دا دەڕواو هەردەم لەتێکۆشان دایە چونکە بەڕاستی (شێرێکە لە لانەکەیدا) ....

بەم جۆرە سەعد بڕیاردەدا لە (دیجلە) بپەڕنەوە ، فەرمانی دا بەلە دواگەڕانی شوێنێکی تەنکایی لە ڕووبارەکە بۆ پەڕینەوە ، ئەوەبوو شوێنێکیان دۆزیەوە کەوا ترسی کەم بوو .. پێش ئەوەی لەشکر بپەڕێتەوە سەعد فەرمانی دا بەشوێنێکی تەئمین لەم دیوی ڕووبار کەوا دەیان بەستێتەوە بە دوژمن ، ئەو کاتە دوو کەتیبەی دروست کرد بۆ ئەوەی پێش لەشکرەکە بچنە ئەم دیوی ڕووبار ، بەرگری لەلەشکرەکە بکەن :
یەکەم کەتیبە : ناوی لێنا کەتیبەی (الأهوال) ، عاصم کوڕی عەمری کرد بە ئەمیری کەتیبەکە .
دووەم کەتیبە: ناوی لێنا کەتیبەی (الخرساء) ئامر کەتیبەکە ناوی ( قەعقاع کوڕی عەمر) بوو .
بەڵێ ئەو ئەخشەی سەعد داینا بۆ ئەم شەڕە سەرکەوتنی هێنا ..

(سلمانی فارسی) کەوا هاوڕێیەکی گیانی بەگیانی سەعد بوو ، لەم جەنگە بەشدار بوو لەپێ دەستی لە لەپی سەعد دەدا لە کەیف خۆشیان و دەیگووت :
[بەڕاستی ئەم ئیسلامە پاک ونوێیە .. واللە ، دەریاش بۆمان مل کەچ بووە ، هەروەک چۆن ووشکانی بۆمان مل کەچ بووە سوێند بەو خوایەی گیانی سەلمانی بەدەستە ، لەم ڕووبارە دەردەچن بەکۆمەڵ ، چۆن چوینە ناوی بەکۆمەڵ ] ...
بەڵێ ... بەم جۆرە ڕووباریان بڕی و لێی دەرچوون ، بێ ئەوەی زیانی یەک سەرباز بدەن و ئازار بە یەک ئەسپیان بگات ..

یەکێک لە موجاهیدان پەرداخێکی لەدەست بەردەبێتەوە ، خەمی خوارد تاکە کەسێک بێت لەنێو هاوڕێکانی شتێکی لێ بزر ببێت ، بانگی هاوڕێکانی کرد بۆ

ئەوەی پەرداخەکە بگرنەوە ، ئەوەبوو شەپۆلە ناوێک پەرداخەکەی بەرزکردەوە ، یەکێک لە موجاهیدەکان هەڵیگرتەوە ..!!
یەکێک لە مێژوو نووسان دەگێڕێتەوە کاتێک بەم دیمەنە جوانە لە ڕووباری دیجلە دەپەڕنەوەو دەڵێت ..
[ سەعد فەرمان دەدا ، مسوڵمانان بڵێن: حسبنا اللـه ونعم الوكيل ... پاشان بەئەسپەکەی دیجلە دەبڕێ و خەڵکیش بەدوای دا دێن ، کەس بەدوا ناکەوێت ، وەها دەڕۆیشتن دەتگووت لەسەر ڕووی زەوی دەڕۆن ڕووی ناوەکەیان داپۆشیبوو بە فەوجە سوارچاک و پیادەکانەوە ، لەناو ئاو قسەیان لەگەڵ یەک دەکرد دەتگووت :لەسەر ڕووی زەوی گفتوگۆ دەکەن ، ئەوەش بەهۆی ئەو هێمنی و ئارامیەی کەلەناو دڵیان دروست ببوو ، بەو بڕواییەی هەیان بوو بە فەرمانی خواو سەرکەوتنی و بەڵێنی و پشتگیری ] ..!!
تەمەنی سەعد درێژبوو ، فیتنەی گەورە هات ، لەخەڵک جیا بۆوە .. بەڵکو فەرمانی دا بە منداڵەکانی وکەس و کاری هەتا دەنگ وباسی ئەم فیتنەشی بۆ نەهێنن ..
ڕۆژێک برازاکەی هاشم کوڕی عتبەی کوڕی أبی وقاص ، دەچێتە لای و پێی دەڵێ :
ئەی مامە ، ئالێرە سەد هەزار شمشێر تەمەشات دەکەن کەوا تۆ شایانی خەلیفایەتی ..سەعد وەلامی دەداتەوەو دەڵێ [ دەمەوێت لەم سەد هەزار شمشێرە ، یەک شمشێر ، ئەگەر لە بڕواداریکت دا هیچی لێ نەکاو ، وەئەگەر لە گاورێکت دا شەقی بکا] ..!
برازاکەی لە مەبەستەکەی گەیشت و وازی لێ هێنا لەم جیا بوونەوەی لەخەڵک ..
ئەو کاتەی معاویە جڵەوی دەسەلاتی گرتە دەست ، پرسیاری لە سەعد کرد :
بۆچی لەگەڵ ئێمە شەڕ ناکەیت .. ؟؟ سەعد وەلامی دایەوە :[ من بە گەردەلولێک تێپەڕیم ، گوتمە حوشترەکەم :ـ یخ ، یخ .. حوشترەکەم یخ بوو ولەپەنای دانیشتم .. ] .
معاویە پێی گووت :ـ لە پەرتووکی خوا .. یخ .. یخ .. نیە ، بەلام خوا دەفەرمووێت:
[وان طائفتان من المؤمنين اقتتلوا ، فأصلحوا بينهما ، فان بغت احداهما على الأخرى ، فقاتلوا التي تبغي حتى تفيء إلى أمر الله]
جەنابت نە لەگەڵ چینە باغیەکە بووی دژی حەقەکە ، نە لەگەڵ حەقەکە بووی دژی باغیەکە .. سەعد وەلامی دایەوەو گووتی :

[ من شەڕ لەگەڵ پیاوێک ناکەم ، واتە عەلی کوڕی أبی طالب – پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو : (أنت مني بمنزلة هارون من موسى ، إلا انه لانبي بعدي) ] .. تۆ بۆ من وەک و شوێنی هارونی لەگەڵ موسا ، بەڵام هیچ پێغەمبەرێک لەدوای من نیە .
لە ساڵی ٥٤ ی کۆچی سەعد تەمەنی گەیشتبووە زیاتر لە هەشتا ساڵ ، کەوا لە ماڵی خۆی بوو چاوەڕێی گەیشتنی بەبارەگای خوای دەکرد ..
کوڕەکەی لە ساتەکانی کۆتایی ژیانی باوکی بۆمان دەگێڕێتەوەو دەڵێت :
[ سەری باوکم لە کۆشم بوو ، لە ئاخیری ژیانی بوو ـ گریام .. باوکم پێی گووتم : چی وا دەکا بگریێیت ئەی کوڕم .. ؟؟ (خوای گەورە بە هیچ جۆرێک ئازارم نادا .. من ئەهلی بەهەشتم) ] ..
کاتێ دەیویست بگات بە خوای گەورە ، ئیشارەی کرد بە صندوقەکەی بۆیان کردەوە ، کراسێکی کۆنیان لەناو دەرهێناو هەمووی دڕابوو ، پاشان فەرمانی بە کەس و کاری کرد بەمە کفنی بکەن !! پێی گووتن: [ بەم کراسە ڕووبەڕوو بوومە لەگەڵ گاورەکان ڕۆژی بەدر ، هەڵم گرتبوو بۆ ئەم ڕۆژە ]...
بەڵێ .. ئەم کراسە تەنها کراسێکی کۆن و دڕا نەبوو ، تەنها کراس نەبوو .. بەڵکو ئاڵایەک بوو لەسەر ژیانە تێکۆشەرەکەی دەشەکایەوە .. لەسەر شانی بڕواداران لاشەی سەعدیان گواستەوە بۆ مەدینە بۆ شاردنەوەی لەتەک ئەوانەی گەیشتبوون بەخوای گەورە ، سەعدیش ئاخیر صەحابیە کۆچ کەرەکان بوو ، کۆچی دوایی کرد ...
خوات لەگەڵ ئەی سەعد .....
خوات لەگەڵ پاڵەوانی قادسیە ، ئەی ئەو کەسەی مەدائینت گرت وئاگری ئاگر پەرستەکانت کوژاندەوە لە فارسەکان ، بۆ هەتا هەتایە ...

## ١٢

# عەبدوڵای کوڕی زوبەیر

## چۆن پیاوێك و چۆن شەهیدێکە ..!!

﴿١٢﴾

# عەبدوڵای کوڕی زوبەیر

## چۆن پیاوێك و چۆن شەهیدێکە ..!!

عەبدوڵا کوڕپەیەکی پیرۆز بوو لەسکی دایکی ، ئەو دایکەی کەوا ئەو بیابانە گەرمەی بڕی لەرێگای ئەو کۆچە مەزنەی ،مەککەی بەجێ هێشت وبەرەو مەدینە رۆیشت ..

قەدەری خوای گەورە وابوو عەبدوڵای کوڕی زوبەیر کۆچ بکات لەگەڵ کۆچکەران ولەکاتێکدا کە لەسکی دایکی بوو ، هێشتا نەهاتبووە سەر دونیا دایکی (أسماء) خوا لێی ڕازی بێت ، هێشتا (قباء)ی نەبڕیبوو لەدەوروبەری شاری مەدینەبوو ، ئەوەبوو ئەم کوڕپە کۆچکردووە لەم کاتانەدا کەوا صەحابیە کۆچکردووەکان تازە پێیان دەنا ناو شاری مەدینە چاوی گەشی بە دونیا هەڵێناو لە دایک بوو ..!! ئەم منداڵە پیرۆزە لە دایک وباوکێکی پیرۆز لەدایک بوو ، هەڵیان گرت و بردیان بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ لەماڵی خۆی لە مەدینە ، ئەویش ماچی کردوو لەتکە خورمایەکی بەدەمی پیرۆزی خۆی تەڕ کردو خستی‌یە دەمی عبداللە ئەویش هەڵیمشت ، یەکەم شت چووە ناو هەناوی عەبدوڵای کوڕی زوبەیر ئاوی دەمی پیرۆزی پێغەمبەری خوا بوو ﷺ

مسوڵمانان لە شاری مەدینە کۆبوونەوەو ، ئەم منداڵە ساوایەیان لەناو بێشکەکەی هەڵگرت و ، پاشان سوڕاندیانەوە لەناو شەقامەکانی مەدینە ولەگەرمەی تەکبیریان دا .. لەبەر ئەوەی ئەو کاتەی پێغەمبەرو صەحابیەکان پێیان نا شاری مەدینە ، جولەکەکان ئاگر لە گیانیان بەربوو ورق وکینەی خۆیان هەڵڕشت ، دەستیان کرد بە جەنگی دەروونی لەگەڵ مسوڵمانان ، پڕوپاگەندەیان کرد کەوا (مالمە) کانیان سحریان لە مسوڵمانەکان کردیەو تووشی نەزۆکیان کردوونە ، لەشاری مەدینەدا منداڵێکی نوێیان نابێت .. کاتێک عەبدوڵای کوڕی زوبەیر لە دایک بوو ، بوو بە بروانامەیەک بۆ درۆو دەلەسەکانی جولەکەی مەدینەو فرت و فێڵ و قسە هەڵبەستراوەکانیان بەتاڵ بۆوە ..!! عەبدوڵا نەگەیشتە تەمەنی بالغ بوون لەسەردەمەی پێغەمبەری خوا ﷺ .. بەڵام لەم سەردەمەدا توانی ، بەهۆی نزیک بوونەوەی لە پێغەمبەرو ئەو پەیوەندی‌یە بەتینەی هەیبوو لەگەڵی ، هەموو مەوادێکی

خاوی پیاوەتی وەربگریّ ... لەگەڵ ڕێبازی ژیانی پێغەمبەر ، هەروەک دەبینین پاش ماوەیەکی تر باس کردنی دونیا پڕدەکات .. بەم جۆرە ئەم منداڵە زۆر بە خێرایی گەورە بوو وگەشەی کردو بەهێز بوو ....

قۆناغی گەنجایەتی ڕازاندەوە بە پاکی وخواپەرستی وقارەمانیەتیەکی لەڕادە بەدەر .. لەگەڵ ڕۆژگار ڕۆیشت ، بەبێ ئەوەی خووڕەوشتی بگۆڕێ و نارەزووەکانی دونیا کاری تێ بکات ، بەڵکو پیاوێک بوو ڕێگای خۆی ناسی و ، بەهێزی خوا ، بڕوایی یەکی بەتین و سەرسوڕهێنەری دروست کرد ...

لەکاتی فەتحی ئیفریقیاو ، ئەندەلوس و ، قوسطنطنیە ، عبداللە تەمەنی تەگەیشتبووە بیست و حەوت ساڵ. قارەمانێک بوو لە قارەمانەکانی ئەم فەتحە ئەمرانە .... بەتایبەتی لەجەنگی ئیفریقیا ، مسوڵمانان وەستابوون بەرامبەر سەدو بیست هەزار سەرباز لەکاتێکدا خۆیان ژمارەیان بیست هەزار بوو ... شەڕ دەستی پێکرد ، ترسێکی گەورە ڕووی لەمسوڵمانان کرد ....

عەبدوڵای کوڕی زوبەیر تەماشایەکی بەدیقەتی هێزی دوژمنی کرد زانی سەروچاوەی هێزەکەیان لەکوێیە ؟ ئەو سەروچاوەش تەنها پاشاو سەرۆکی بەربەر بوو ، هاواری دەکردە سەر سەربازەکان و بەهاوار کردنێکی وا پاڵی پێوە دەنان بۆ مردن بە شێوەیەکی زۆر سەرسوڕهێنەر ...

(عەبدوڵای کوڕی زوبەیر) هەستی کرد کەوا ئەم جەنگە خوێناوی‌یە کۆتایی نایەت و ناتوانرێ سەرکەوتن بەدەست بهێنن ، تەنها بە کوشتنی ئەم پادشا کەللە ڕەقە نەبێت .... بەڵام چ ڕێگایەک دەیگەیەنێت ، لەشکری یەکجار گەورەی لە پێشە ، بەبێ گەڕانەوە شەڕ دەکەن .. ؟!!

بەڵام خۆڕاگری ونازایەتی ورەی زوبەیر جێگای ئەم جۆرە پرسیارانە نی‌یە !!

لێرەدا بانگی چەند برایەکی کردو ، پێیانی گوت : [ پارێزگاری پشتەوەم بکەن ، لەگەڵم پەلامار بدەن ] ..

ڕیزەکانی دوژمنی وەکو شمشێرکی خۆڕاگر بڕی و بەرەو سەرۆکەکە ڕۆیشت ، تاکو گەیشتە سەری و بەیەک جار ئەوی کردی پی‌ی کرد ، پاشان سوڕاوە بەدەوری ئەو سەربازانەی پارێزگاریان دەکردە پادشایەکەیان و پشتیان لی گرتن و .. لە گرمەی (اللە أکبر) یان دا ...

مسولّمانان بینیان ئالاّکەیان لەم شوێنە بەرز دەبێتەوە ، کەوا سەرۆکی بەربەرەکان تێیدا فەرمانەکانی لێ دەردەچێت وتێیدا هانی سوپاکەی دەدا ، زانیان سەرکەوتن مسۆگەر بووە ، خۆیان بەهێزێکی بێ وێنە ڕاگرت تاسەرەنجام هەموو شتێک بە قازانجی مسولّمانان کۆتایی هات . .

سەرۆکی سوپای مسولّمانان (عەبدولاّی کوڕی أبی سەرح) بەم دەورە مەزنەی (کوڕی زوبەیر) ی زانی ڕێزی ئەوەی دایێ کەوا بچێ بۆ شاری مەدینەو مزگێنی ئەم سەرکەوتنە گەورە بدات بە خەلیفەی مسولّمانان (عثمان کوری عفان) ودانیشتوانی مەدینە . . لەگەلّ ئەوەی کەوا زۆر ئازاو بلیمەت بوو لە جەنگدا هەروەها لە خوا پەرستیش دا ئازایەتی لە جەنگ کەمتر نەبوو . . ئەم سیفاتە وادەکات کەوا (عەبدولاّی کوڕی زوبەیر) ببێتە پێشەنگ وپێشەوای خوا پەرستان وجێگایەکی بەردەوام بلّندی هەبێت لەنێو خواپەرستان . . .

ئەگەنجاتیەکەی و ، ئەپلەو پایەو ،ئەبنەمالّەو ، ئەهێزو ، ئەسامان . .هیچ شتێک ئەیتوانی جێگا بە (عەبدولاّی کوڕی زوبەیر) بگۆڕێ ، بەلّکو خوا پەرستێک بوو بەڕۆژ بەڕۆژوو دەبوو ، شەو هەلّدەستاو بۆ شەونوێژو ، خشوع و ترسێکی وای هەبوو عەقلّ و هۆش سەرسام دەبوو لەگەلّی . . عومەری کوڕی عبدولعەزیز ڕۆژێک گووتیە کوڕی أبی مولەیکە ، : باسی عەبدولاّی کوڕی زوبەیر مان بۆبکە . . ئەویش گووتی :.

[ واللە ، هیچ دلّ و دەرونێکم نەدیووە وەکو ئەو . . کاتێک دەکەوتە ناو نوێژەوە ، هەموو شتێکی لەیاد دەچوو . . کاتێک ڕکوعی دەبرد یان سوجدە ، چۆلەکە لەسەر پشتی بنیشتبایە وای دەزانی دیوارە ، یان ڕایەخێکی ڕاخراوە ئەوەندە سوجدەو ڕکوعی درێژبوو . . . .

(جارێکیان قازیفەیەکی مەنجەنیق بەبەردەم ڕیش و سنگی دارۆیشت ئەویش نوێژی دەکرد ، سوێند بە (اللە) هەستی پێ نەکردو لە شوێنی خۆی نەجولاّو ، خوێندنەوەی قورئانی تێدا نەبڕی و ، پەلەی نەکرد لەرکوعەکانی . .] . .!! دەنگ وباس وگێڕانەوەی خوا پەرستی (کوڕی زوبەیر) هەروەکو مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە شتێکە هەر لە داستان دەچێت . .

کاتی بە ڕۆژوو بوونی ، نوێژ کردنی ، حەجکردنی و ، بەرزی دەروونی و غیرەتی. . . کاتی شەوانی . . بە درێژایی تەمەنی هەر شەو نوێژو خواپەرستی بوو . . کاتی دەرچوونی بەدرێژایی تەمەنی بەڕۆژوو بوون و جیهاد بوو . .

ئیمان وبڕوایی یەکی زۆر بە تینی بە خوا هەبوو ، ترسێکی بەردەوامی لەدڵدا هەبوو بەرامبەر بەخوا

لە (ابن عباس) یان پرسی دەربارەی عبداللـه ی کوڕی زوبێر گووتی :

[قورئان خوێن بوو ، بەدوای سونەتەکانی پێغەمەر دەکەوت و .. شەونوێژی دەکردو بەڕۆژ بەڕۆژوو دەبوو ، کوڕی حەواری پێغەمبەری خوابوو ، دایکی (أسماء) ی کچی صدیق بوو.. (عائشە) خێزانی پێغەمبەری خوا پووری بوو ، یەکێک دەرهەقی خۆی گێل دەکات کەوا خوا کوێری کردبێ] ....

کوڕی زوبەیر لەوەسفی خووڕەوشت وسیفەتەکانی وەکو چیایەکی چەسپاو بوو ..دڵ و دەروون پاک ، بە عیززەت و خۆڕاگر ، قارەمان ونازا .. بەردەوام ئامادەبوو گیانی خۆ پێش کەش بکات بەرپێبازە ڕاستەکەی و بەبڕیارە ڕاستەکانی ...

لەکاتی جەنگ کردن و شەڕ کردنی لەگەڵ ئەمەویەکان ، (حوصەین کوڕی نمیر) سەرۆکی لەشکر کەوا یەزید ڕەوانەی لای عەبدولای کوڕی زوبەیری کردبوو بۆ کوژاندنەوەی شۆڕشەکەی لەکاتی چوونەلای دەنگ وباس گەیشتە مەکە گوایە (یەزید) مردووە ... حوصەین داوای لە عەبدولا کرد لەگەڵی بێت بۆ شام وهەوڵی بۆ بدات بۆ ئەوەی بەیعەی خەلیفایەتی بدەن بە ئەو ....

بەڵام (عبداللـه) ئەم دەرفەتە زێرینەی لەدەست خۆی دا .. لەبەر ئەوەی دەیگووت پێویستە تۆڵەیەکی گەورە لە لەشکری شام بکرێتەوە بەرامبەر ئەو هێرشە دڕندانەی کردیان بۆ سەر شاری پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خزمەت کردنی ئارەزووەکانی ئەمەویەکان ...ئێمە لێرەدا جیاوازین لەگەڵ هەڵوێستی عەبدولا ، تەمەنای ئەوە دەکەین کەوا عەبدولا نەدەبایە ئەم دەرفەتە بێوێنەی (حوصەین) سەرۆکی لەشکری یەزیدی لەدەست خۆیدایە ... بەڵام هەڵوێستی پیاوانەی عەبدولا چ پیاوێک ئەو قەناعەت و بڕوایی وابوو ، فێڵ و تەڵەکەکانیان هەڵدەوەشێنێتەوە ، بەڕاستی ئەم هەڵوێستەی عەبدولا جێگای سەر سووڕمان وڕێزلێنانە ....

کاتێک حەجاجی خوێن ڕێژ بە سوپاکەی پەلاماری بۆ هێنان ، ئابلۆقەیەکی ترسناکی عەبدولاو کۆمەڵەکەی دا ، لەنێوان موجاهیدەکانی دا ژمارەیەکی زۆر لە تیرهاوێژ هەبوون ، کەوا شارەزایی یەکی زۆریان هەبوو لەتیرهاوێشتن و ، شەڕکردن گوێی لی یان بوون قسەیان دەکرد دەربارەی خەلیفەی ڕابردوو (عثمان) خوالی ی ڕازی

بێت ، هیچ ترسی خوای لەناو نەبوو ، زۆر بێ ویژدانانە باسیان دەکرد ، ئەویش بەرەنگاریان بۆوەو پێی گوتن :
[والله ما أحب أن أستظهر على عدوي بمن يبغض عثمان ] ..!!
واتە: (سوێند بەخوا ، حەز ناکەم پشت ببەستم بەکەسانێک بۆ سەر دوژمنەکانم ، ئەو کەسانە ڕق وقینیان لە عوثمان ببێتەوە) ..!! پاشان دەری کردن لەکاتێکدا کەوا زۆر پێویستی بە یارمەتی هەبوو ، یارمەتی یەکی وا لە فەوتان ڕزگاری دەکرد ..!!
پاکی عەبدولاّ لەگەڵ دەروونی و ، ڕاستگۆیی لەگەڵ بیروباوەڕی ڕێبازەکەی ، گرنگی بەوەندا زیانی دووسەد تیر هاوێژی بلیمەتی لی کەوتووە ، لەگەڵ ئەوەی لە جەنگێکی یەکجارەکی یەو کۆتایی پێ دەهێنێ ، لەبەر ئەوەی ئەم تیرو هاوێژانە وازیان لە ئایینەکەیان هێناوەو جێگای بڕوایی ودڵنیایی عەبدولاّنێن و ، گەورەترین کارەسات کەبەسەر لەشکری مسوڵمانان دابێت و یارمەتی خوای گەورەیان بۆ نەیەت گوناهی لەشکرە ....!!
بەڕاستی خۆڕاگری عەبدولاّ بەرامبەر یەزید نازایەتیەکی ڕاددە بەدەرە .. تەماشای دەکرد یەزیدی کوڕی معاویەی کوڕی أبی سوفیان ئاخیر پیاوێکە دەیکەن بە خەلیفەی مسوڵمانان ، ئەگەر بشێت بۆ ئەم کارە ..بەلاّم بە بیروباوەڕی عەبدولاّ ، یەزید بەکەڵکی هیچ شتێک نایەت ، هیچ چاکەیەکی نیە بۆ ئەوەی شەفاعەت بۆ تاوان وگوناهەکانی بکات هەروەک مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە ....
ئایا چۆن دەبێت کوڕی زوبەیری کوڕی عەوام موبایەعە بدات بە یەزید ..؟!!
ووشەیەکی بەهێزی وەک قازیفە ئاراستەی معاویە کرد کاتێک زیندوو بوو ...
بەڵێ ئەم ووشەی گوتی لەگەڵ یەزیدی بوو ، پاشان یەزید وەعدەی خراپترین چارەنووسیدا بەکوڕی زوبەیر کاتێک بوو بە خەلیفە ..!!
ئەم ووشەیەی کوڕی زوبەیر ئاراستەی یەزیدی کرد ئەوە بوو :
[ لا أبايع (السكير) أبداً]
واتە : موبایەعەی سەر خۆشێک ناکەم بە هیچ جۆرێک ..
پاشان ئەم دێڕە شیعرەی خوێند :
ولا ألين لغير الحق أساله حتى يلين لضرس الماضغ الحجر
عەبدولاّی کوڕی زوبەیر ئەمیری مسوڵمانان بوو ، پایتەختەکەی مەککەی موکەڕەمە بوو ، دەسەلاّتی باڵی کێشابوو بەسەر حیجازو ، یەمەن و ، بەسرەو ، کوفەو

، خوراسان و ، هەموو شام بێجگە لە (دیمەشق) نەبێت پاش ئەوەی خەڵکی ئەم شوێنانە موبایەعەیان کردبوو . .بەڵام ئەمەویەکان ئۆقرەیان نەبوو ، لە شوێنی خۆیان ڕانەدەوەستان ، ئەوە بوو چەند پەلامارێکی یەک لەدوای یەکیان دەکرد ، لەزۆربەیان تەنها شکان وڕیسواییان بۆ دەماوە . .

تاکو (عبدالملک کوڕی مروان) هاتە سەر دەسەڵات و سوپایەکی ناردە سەر عەبدوڵا لەشاری مەککە بەسەرکردایەتی خراپترین ئادەمیزاد و خوێن ڕێژترین وستەمکارترین کەس . . ئەم پیاوە ستەمکارو زاڵمەش (حەجاجی ثقفي) بوو ، هەروەک ئیمامی دادپەروەر عومەر کوڕی عەبدولعەزیز دەرهەقی دەفەرمووێت:

[لو جاءت كل أمة بخطاياها، وجئنا نحن بالحجاج وحده ، لرجعناهم جميعا"].

واتە ئەگەر هەر ئومەتێک بەهەموو گوناهەکانیان بێنە پێش ، ئێمەش تەنها بە حەجاج بێینە پێشەوە ، سەرتاپا هەموویان دەگێڕینەوە . . . .

حەجاج سەرکردایەتی لەشکرەکەی کردو ، بۆ پەلاماری پایتەختی عەبدولای کوڕی زوبەیر ، بۆ ماوەی شەش مانگ دەورەی شاری مەککەو خەڵکەکەی دا لەم ماوەیەدا ئاوو خۆراکی لی بڕین ـ بۆ ئەوەی عەبدولای کوڕی زوبەیر بەجێ بهێڵن و بەتەنهای بهێڵنەوە . . . .

لەژێر ئەم برسیتی یە جەرگ بڕە زۆربەی لەشکرەکەی عەبدوڵا خۆیان دا بەدەستەوە ، عەبدوڵا بەتەنهاو تەنها ماوە . . . لەگەڵ ئەوەش دەرفەتی هەبوو بۆ ئەوەی خۆی ڕزگار بکات ، بەم جۆرە عەبدوڵا بڕیاری دا ئەم لێپرسراویەتی یە هەتا کۆتایی ببات ، شەڕ لەگەڵ لەشکری حەجاجی خوێن ڕێژ بکات . . ئەوکاتە عەبدوڵا تەمەنی حەفتا ساڵ بوو . . . !! هەروەها ئەم قسە جەرگ بڕە ئازایانەی عەبدوڵا هەرگیزاو هەرگیز لەیادناکرێت لەگەڵ دایکی ئێستاش باگوێ بگرین لەم گفتو گۆیەی نێوان عەبدوڵاو دایکی . . . دایکی بەڕێزی کچی (أبو بکری صەددیق) (أسماء) ی خواناسی بڕوادار لە چەند سەعاتێک کەلەژیانی دا مابۆوە . . ئەوەبوو عەبدوڵا چوو لای دایکی خۆشەویستی دایکیشی باشترین و مەزنترین هەڵوێستی دا بەکوڕە شیرینەکەی . . !!

(أسماء) پێ ی گووت !

[ ئەی ڕۆڵەکەم ، تۆ بە خۆت دەزانی ئەگەر لەسەر هەقی و ، بانگی هەق دەکەیت ، ئارام بگرە لەسەری تاکو لە ڕێگای دەمری ، وە سەریش شۆڕ مەکە بۆ منداڵانی ئەوەی

(يخرج من ثقيف كذاب ومبير)
واته :. لەسەقەفیەکان درۆزن وخراپەکار پەیدا دەبێ ..
(هەرچی درۆزنە ئەوا بینیمان ، بەڵام خراپەکار نەمانبینیووە تەنها تۆ نەبێت) .

عەبدوڵای کوڕی عومەر خوای لی رازی بێت بەشێوەی پرسە لێکردن چووە لای و داوای ئارام گرتنی لی کرد ، ئەویش بەم جۆرە وەڵامی دایەوە :[چ شتێک ڕێگام لی دەگرێ لەسەر ئارام گرتن ، سەری یەحیای کوڕی زەکەریایان بەدیاری برد بۆیەکێک لە داوێن پیسەکانی بەنی ئیسرائیل] ..!!

بەڕاستی زۆر مەزنی ، ئەی کچی صەددیق ..!!!

لەبەر ئەوەی جوانترین ووشەت ئاڕاستەی ئەو لەخوانەترسانە کرد لەکاتێکدا سەری کوڕە شیرینەکەیان بڕی و لاشەکەیان لەسێدارەدا

بەڵێ. ئەگەر سەری عەبدوڵای کوڕی زوبەیر بردرا بەدیاری بۆ یەزید ..

سەری پێغەمبەری بەرێزیش (یحیی) بردرا بەدیاری بۆ داوێن پیسێکی بەنی ئیسرائیلی ..!!

سەلامی خوا لە شەهیدی خواناس عەبدوڵای کوڕی زوبەیر ...

سەلامی خوا لە (أسماء) کچی ئەبو بکری صەدیق ....

ئومەیە ، وە ئەگەر دەشزانی نیازت دونیایە ، تۆ لە هەموو بەندەیەک خرابتری ، خۆت و ئەوانەی لەگەڵت دان کەوا بە کوشتنت دان و تووشی فەوتان و هیلاکەتت کردن]
عەبدوڵاش وەڵامی دایەوەو پێی گوت:
[سوێند بەخوا ئەی دایکە ، نیازم دونیا نەبووە چۆکم بۆ دانەنوانەووە .. لەفەرمانی خوا بەهیچ جۆرێک لام نەداوە ، وەستەمیشم نەکردووەو ، غەدرم لەکەس نەکردووە ] ..
دایکی ( أسماء ) پێی گووت :
[داواکارم لەخوا دوعای خێرت بۆ بکەم ئەگەر لە پێش من گەیشتی بەخوا ، یاخن لە پاش من گەیشتی .. ( پەروەردگارا ، بەزەییت بێتەوە بەزۆر هەستانەوەی لەکاتی شەودا ، وەبەتینوێتی لەچۆڵ و بیاباندا ، وەبەباش جولانەوەی لەگەڵ دایک و باوکیا ... )
( پەروەردگارا من ئەوا تەسلیمی تۆم کرد ، وەڕازیم بەوەی ڕوودەدا ، پاداشتی عەبدوڵای کوڕی زوبەیر بدەوە بەپاداشتی ئارام گرتوو و سوپاسکاران ..!] .
بەم جۆرە ماڵ ئاوایی یان لەیەک کردو یەکتریان بەجێ هێشت....
پاش چەند سەعاتێک لەم کاتەدا کوشتارێکی کوشندە دەستی پێکرد لەشکرێکی بێ ژمارە لەگەڵ چەند کەسێک ، شەهیدی مەزن لێدانێکی مردنی پێ کەوت و ، ئالەم کاتەدا هەموو ڕق و قینێکی ناو دڵە ڕەشەکەی خۆی هەڵڕشت ، هەڵسا بە لە سێدارەدانی لاشەی بێ جولەی ....
دایکی پیری ، کەوا لەتەمەنی نۆهەدو حەوت ساڵان دابوو هەستا بۆ ئەوەی چاوی بەلاشە لەسێدارە دراوەکەی کوڕە شیرینەکەی بکەوێت ..
( أسماء ) وەکو کۆڵەگەیەکی چەسپاو ڕاوەستا بەبێ ئەوەی ترس دایبگرێت بەرامبەر حەجاجی ڕیسواو ناپاک .. حەجاج پێی گووت :
- ئەی دایکە ، ئەمیری بڕواداران عبدالملک کوڕی مەروان وەسیەتی کردووم لەگەڵ تۆ چاک بم ، ئایا هیچ پێویستیەکت هەیە .. ؟
( أسماء ) وەڵامی حەجاجی دایەوەو فەرمووی :
من دایکی تۆ نیم ....
من دایکی ئەو لەسێدارە دراوەم کە لەم بەرزاییەیە ..
( پێویستم بە یارمەتی ئێوە نیە
(بەڵام قسەیەکت بۆ دەکەم گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە دەیفەرموو :

## ١٣

# بەڕائی کوڕی مالیك

## ئەو شەهیدەی دروشمی (اللە ، والجنة) بوو

﴿١٣﴾

# بەڕائی کوڕی مالیك

## ئەو شەهیدەی دروشمی (الله ، والجنة) بوو

یەکێکە لەم دوو برایانەی بۆ خوا ژیان ، پەیمانێکیان دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژ بە ڕۆژ لە گەشەو پەرەسەندن دابوو .... یەکەمیان (ئەنەسی کوڕی مالیک) ـە خزمەتکاری پێغەمبەری خوا بوو ﷺ ، دایکی کە ناوی (أم سلیم) بوو بردی بۆلای پێغەمبەر تەمەنی لەم کاتە دە ساڵان بوو گووتی :-

[ئەی پێغەمبەری خوا .... ئەوە ئەنەسە کوڕی تۆیە و خزمەتت دەکا ، تکای بۆ بکە لە خوا]

ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ نێو چەوانی ماچ کرد و دوعای بۆ کرد بەلاّم چ دوعایەک ! دوعایەک بەردەوام بەرەو خێرو تەمەنێکی درێژی بە چاکەو بەرەکەت ... پێغەمبەر ﷺ دوعای بۆ کردو فەرمووی :-

[ خودایە ماڵ و منداڵی زیاد کەو ، بەرەکەتی بێخە ناوی و ، بیبە بەهەشت] ..

بەم جۆرە ئەنەس نۆهەدو نۆ ساڵ ژیاو ، منداڵ ونەوەیەکی زۆری پێداو ، هەر خوا بە خۆی دەزانی چ سامانێکی پێ بەخشی ، ڕەزوباوانێکی گەورەی وەها ، ساڵێ دووجار بەری دەگرت .....

**دووەم برا ، بەڕائی کوڕی مالیك بوو ....**

بە ژیانێکی بەختەوەرانە و تێکۆشەرانە ژیا ، دروشمیشی :[ الله ، والجنة] .. بوو..

هەر کەسێک بیبینایە ، چۆن شەڕێک دەکات لە پێناوی خوا ، سەری سووڕ دەما بەسەر سووڕمانێکی وا ، لە ژیانی شتی وای نەدیتبێ .....

بەلاّم لەگەڵ ئەمەش کاتێک بەڕاء شەڕی دەکرد لە پێناوی خوا بە شمشێرەکەی لە سەرکەوتن نەدەگەڕا ، لە کاتێکدا سەرکەوتن بەرزترین ئامانج بوو لەم کاتەدا ، بەڵکو بەڕاء دەگەڕا بەدوای شەهید بوون دا ....

هەموو هیوای بەڕاء لەژیانیدا ، ئەوە بوو بمرێ بە شەهیدی و ئەجەلی لەسەر گۆڕەپانی جەنگێک بێت لەجەنگەکانی ئیسلام دژی بێ باوەڕان ..... لە پێناوی ئەم مەبەستەدا ، لەهیچ جەنگێک بەڕاء دوانەکەوت .... ڕۆژێک هاوڕێکانی سەردانیان کرد کەوا نەخۆش بوو ، بەڕاء ڕووی تێکردن و گووتی : [ئێوە وادەزانن من لەسەر جێگا دەمرم . نا واللە خوا بێ بەشم ناکا لەشەهادەت] ....!!

خوای گەورەش گومانەکەی بەڕائی بەڕاست داناو ، (بەڕاء) لەسەر جێگا نەمردو ، بەڵکو مرد بە شەهیدی لە جەنگێک ، لە مەزنترین جەنگەکانی ئیسلام ....!!

بەڕاستی پاڵەوانیەتی بەڕاء ڕۆژی یەمامە شایانی خۆیەتی .... شایانێک بۆ پاڵەوانێک کەوا عومەری کوڕی خەتاب فەرمانی دا بە هیچ جۆرێک سەرۆکایەتی نەدەنە دەست ، لەبەر ئەوەی ئازایەتی و جورئەتی بەڕاء ئەوە بوو دەگەڕا لە مردن ...

ئەوشتە وای کردبوو سەرۆکایەتی نەدرێتە دەست ، نەبادا جەنگاوەرانی تووشی لەناو چوون بکردایە ...!! ڕۆژی یەمامە کاتێک سوپای ئیسلام بە سەرۆکایەتی (خالید) ئامادە بوو بۆ جەنگ لە گەڵ هەڵگەڕاوەکان ، بەڕاء لەم ڕۆژەدا بەرامبەر دوژمن وەستا بوو ، بەڵام چ وەستانێک ، وەستانێک وای دەزانی چەند ساڵان بە پێوە وەستاوە ، ئەوەندە بە پەلەبوو بۆ ڕووبەڕووبوونەوە ، چاوە گەشەکانی وەک و چاوی شێر دەسوڕاند بۆ ئەوەی زوو بگات بە گیانی دوژمنان .. پەلاماری نێچیرەکەی بدات ..!! بەڵی ، هیچ شتێک لەم دنیایە بێ ئاگای نەکردبوو بێجگە لەم مەبەستە ... (خالید) بانگی کرد : (اللەاکبر) ، ڕیزە پتەوەکان بۆ شوێنی خۆیان دەرچوون ، (بەڕاء)ی عاشقی مردن لەگەڵیان بۆی دەرچوو .....

ڕۆیشت بۆیان شوێن کەوتووانی موسەیلەمەی درۆزنی بە شمشێرەکەی دووریەوە ، ئەوەبوو وەک و گەڵای پایزان دەکەوتنە خوارەوە لە ژێر زەبروهێزی ئەم پاڵەوانانە .... هەرچەندە سوپای (موسەیلەمە) سوپایەکی لاوازو کەم نەبوو ، بەڵکو ترسناکترین لەشکر بوو لەهەموو لەشکرە هەڵگەڕاوەکان .....

بە زۆری سوپاکەو ، لە جۆری چەک و ، جەنگاوەرانی ، ترسناکترینی جەنگەکان بوو ..

هەڵگەڕاوەکان توانیان بەرگری مسوڵمانان بکەن ، بەرگریەکی لە ڕادە بەدەر لە توندوتیژی ، هەتاکو دەیانویست سەرکەوتن بەدەست بهێنن ، بەهۆی ئەو پەلامارە یەک لە دوای یەکانەی کە دەیانکردە سەر مسوڵمانان . . .

لێرەدا ترسێکی زۆر لەناو ڕیزی مسوڵمانان دروست بوو ، سەرۆک وفەرماندەکانیان ووتار دەرەکانیان لەسەر پشتی ولاخەکانیان بانگی ووشەی خۆڕاگرییان دەکرد ، بەڵێنەکانی خوایان بەیاد دەهێنانەوە .

بەرائی کوڕی مالیک دەنگێکی خۆش و بەرزی هەبوو .. خالد سەرۆکی مسوڵمانان بانگی بەرائی کردو گووتی بادەنگت بێت . . . . !!

(بەراء) هاواری کرد بە چەند ووشەیەکی جوان ۆ بەهێزو پە مانا . . . ئەوانیش ئەوە بوون : [ئەی خەڵکی مەدینە ، ئیمڕۆ مەدینە هی ئێوە نیە ، بەڵکو خواو بە هەشت ئەبێ] . . . .

بەڵێ . . . [ الله ، والجنه] لە پێش ئەوانەن !!

هەتا شاری مەدینە ، پایتەختی ئیسلام ، شارێک ماڵ ومنداڵ وژنەکانیان لێ بەجێ هێشتووە ، نابێت بیری لێ بکەنەوە ، لەبەر ئەوەی ئەگەر ئەمڕۆ بشکێنن . . . مەدینە ئی وان نیەو دەکەوێتە بەر دەستی دوژمن . . . .

بەم جۆرە دەنگ و سەدای (بەراء) وەکو شەپۆلی ئاو دەگەیشتە موجاهیدەکان پاش ماوەیەکی کەم لەگەڵ نەڕەی دەنگی بەراء مسوڵمانان بەخۆهاتنەوەو ئەنجامی جەنگەکە پێچەوانە بۆوە . . .

مسوڵمانان بەرەو پێش چوون و ، سەرکەوتنی یەکجارەکیان نزیک بۆوە . . . بێ باوەڕان دەشکان ، بە شکستێکی بێ وێنە . . . .

بەرائیش لەگەڵ هاورێکانی دەکەوتنە دوایان ئالای پێغەمبەرکەیان ﷺ بەرزکردبۆوە .

بێ باوەڕەکان پاشەکشەیان دەکردو هەڵدەهاتن ، خۆیان دەهاوێشتە ناو قەڵایەکەو پەنایان بۆ دەبرد . . .

ئەوە بوو لەم دیوی سنووری قەڵاکە ، دەرگایەکەیان لەسەرە خۆیان داخست . . .

لێرەدا (بەراء) وا خەیاڵی بۆهات و بانگی کرد :.

[ئەی کۆمەلانی مسولمانان ، هەلمگرن و فڕێم بدەنە ناو ئەم دیووی شورەی باخچەکە ئەی پێم نەگووتن من بەدوای سەرکەوتن ناگەڕێم ، بەلکو بەدوای شەهید بوون دەگەڕێم] ..

وای تێ ڕادەبینی پیلانی ئەم جارەی باشترین کۆتایی یە بۆ ژیانیو ، باشترین جۆری مردنە ...!!

لەم کات و ساتانەدا (بەراء) خۆی خستە ناو باخچەی قەلاکەو دەرگاکەی بۆ مسولمانان کردەوە شمشێری بێ باوەڕانیش لەشی (بەراء) کون کون دەکەن ، تا لەم کاتەنەش دەرگاکانی بەهەشت دەرازانەوە بۆ پێشوازی کردن لە میوانی نوێی تێکۆشەر...

(بەراء) چاوەڕوانی ئەوەی نەکرد موجاهیدەکان هەلیگرن و فڕێی دەنە ناو حەدیقەکە ، بەلکو بە دیواری حەدیقەکە هەلگەڕا ، خۆی هاوێشتە ناو حەدیقەکەو ، دەرگاکەی بۆ مسولمانان کردەوە ، سوپای ئیسلام هاتنە ناویەوە .....

بەلام خەونی بەراء نەهاتەدیو ، شمشێری بێ باوەڕان کۆتایی بەژیانی نەهێناو ئەو مەبەستەی کەوا چاوەڕێی دەکرد نەهاتەدی ... چونکە مردن بە ئەجەلەو بە حەزکردن و نارەزوو نیە ، ئیمامی (ابوبکر) خوا لێی ڕازی بێت ڕاستی گووتوە ، کەدەلێت :

[احرص على الموت ... توهب لك الحياة] ...!!

واتە : سوورەبە لەسەر مردن .... ژیانت دەبێت ...!!

ڕاستە جەستەی موجاهیدی خوا لەم ڕۆژەدا هەشتا وهەشت .... تۆلێدانی بە شمشێرو ڕم بەرکەوت و .... هەشتا و ئەوەندە برینەی دروست کرد ، هەتا یەک مانگی برد پاش ئەم جەنگە ، (خالید کوڕی وەلید) سەرپەرشتی چارەسەری بەڕائی کوڕی مالیکی دەکرد ...

بەلام هەموو ئەمانە مەبەستی بەراء نەبوو کەوا تەمەنای دەکرد ... ئەم چاک بوونەوەیەش بەڕائی نا ئومێد نەکرد ، .. بەیانی جەنگ لە دوای جەنگ دێت ..

پێغەمبەر ﷺ پێی ڕاگەیاندووە کەوا دوعاکانی قەبوولە ... تەنها ئەوەی لەسەرە کەوا دوعا بکات لە خودا ، شەهادەتی پێ ببەخشێ ، پەلە نەکات ، چونکە هەر مردنێک کاتێکی دیاری کراوی بۆ دانراوە ...!!

ئەوەتا بەرائی کوڕی مالیک برینەکانی ڕۆژی یەمامەی چاک بۆوە ...

دووبارە لەگەڵ سوپای ئیسلام بۆ لەگۆڕنانی هێزی تاریکی ... ئەو کاتە دوو ئیمپریاتۆریەتی کۆن ودیکتاتۆر ، ڕۆمەکان وفارسەکان ، بەهێزە دڕندەکانیان خاکی خوایان داگیرکردبوو ، خەڵکانیان دەچەوساندەوە ... (براء) یش هێزی کوشندەی لێدەدان و ، لە شوێنی هەر لێداتێکیش بینای بەرزی نوێی جیهانی دروست دەکرد ، کەوا گەشەی دەکرد لەژێر ئالآی ئیسلام ، گەشەیەکی بەخێرایی وەک ڕۆژی هەلآتوو ..

لەیەکێک لە جەنگەکانی عێراق فارسەکان پەنایان برد بۆ شەڕێکی وا هەموو دڕندەیی و زانایی خۆیان تێدا بەکارهێنا ، ئەوەندەی لە توانایان بوو ..

کەرەستەی جەنگی قولابی چەسپاوی سوورکراوەیان بە ئاگر بەکارهێنا ، لە قەلآ بەرزەکانیان ئاگر بارانی موسڵمانەکانیان دەکرد ، بەهەر یەکێک بکەوتایە دەیکوشت و نەیدەتوانی خۆی لێ ڕزگار بکات ...

بەرائو براکەی (ئەنەس) کاری ئەم قەلآیەیان پێ سپێردرابوو لەگەڵ کۆمەڵێک لە مسوڵمانان ...

بەلآم یەکێک لەم قولابانە کاتێک کەوتە خوارەوە ، بە (ئەنەس) وەنووسا ، ئەنەس نەیتوانی ئەم زنجیرە قولابە لە خۆی بکاتەوە ، کەوا گڵپەی ئاگری لێ هەڵدەستا ...

(بەراء) ئەم ڕووداوەی بینی ... بەخێرایی بەرەو براکەی چوو بۆ ئەوەی قولاپەکەی لە لەشی بکاتەوە پێش ئەوەی بڵندی کەنەوە بۆ سەر قەلآکە ، زنجیرەکەی بەدەست گرت و بە خێرایی لە لەشی ئەنەسی کردەوە ، ئەنەس ڕزگاری بوو ، بەلآم بەراء هەرچی گۆشت هەبوو لەناو دەستی نەما ، پەیکەرێکی ئێسکی ڕەقی سووتاو ماوە ...!!

ماوەیەکی زۆری پێچوو تا دەستی چاک بۆوە ...

بەلآم ئێستا کە عاشقی مردن دەگا بە هیواو مەبەست و معشوقی خۆی ... ؟؟ بەڵێ .... هەر ئێستاکە ...!!

ئەوەش جێگایەکە کە پێی دەڵێن (توستەر) لەنێران سوپای کوفرو ئیمان و ڕوناکی وتاریکی پێک دەگەن ئەم ڕۆژە دەبێتە جەژنی جەژنان بۆ بەرائی کوڕی مالیک ....

خەڵکی ئەهوازو فارس کۆبوونەوە بە سوپایەکی زۆر بۆ جەنگی یەکجارەکی مسوڵمانان ... گەورەی مسوڵمانان (عومەری کوڕی خەتاب) بۆ (سەعدی کوڕی ابی وقاص)ی نووسی لە کوفە، بۆ ناردنی سوپایەک بۆ سەر (ئەهواز)...

وە بۆ (ابي موسی الاشعري) نووسی لە بەسرا ، بۆ ناردنی سوپایەک بۆ سەر ئەهواز ، لە نامەکەیدا فەرمووی :-

[ (سهیل کوڕی عدی) بکەن بە ئەمیر .. بەرائی کوڕی مالیکیش لە گەڵیدا بێت] ..

هەردوو سوپای مسوڵمانان لە بەسراو کوفە بە یەک گەیشتن بۆ ڕوویەڕوو بوونەوە لەگەڵ سوپای فارس و ئەهواز لە جەنگێکی کوشندە .....

بەڵێ ، ئەم دوو برا مەزنە لە نێو سەربازە بڕوادارەکان بوون ...... ئەنەسی کوڕی مالیک و ، بەرائی کوڕی مالیک ....

جەنگ دەستی پێکرد بە شەڕی بەرامبەری ، بەرائی کوڕی مالیک لەگەڵ سەد کەس لە سوپای فارس کەوتنە بەرامبەریەک وهەر هەموویانیدا بەزەوی پاشان دوو سوپاکە تێکەڵ یەک بوون ، کوشتن وکوشتار لە هەردوولا یەکجار زۆر دەرکەوت .....

هەندێک لە صەحابیەکان لە بەراء نزیک کەوتنەوە ، ئەو کاتە شەڕ گەرم بوو ، بانگیان کردو پێیان گووت :-

[ئەی بەراء قسەی پێغەمبەرت ﷺ بەیادا نایەتەوەکە دەیفەرموو : (رب اشعث اغبر ذي طمرين لا يؤبه له ، لو اقسم على الله لابره ، منهم البراء بن مالك ...؟!
(يا براء ، اقسم على ربك ، ليهزمهم وينصرنا] ....

واتە :-

[ پرچ قژو دوو جل خراپ بایەخ بەخۆ نەدەر هەیە ، ئەگەر سوێند بخۆن لەسەر خوا سوێندەکەیان ناشکێنێ ، (بەراء) ی کوڕی مالیک لەم چەشنە کەسانەیە ... ؟!

[ئەی بەراء ، سوێند لەسەر خوات بخۆ ، بۆ ئەوەی بشکێن وسەرکەوتووبین بە سەریاندا] .

بەرائی کوڕی مالیک دەستی بڵند کرد بۆ ئاسمان و داوای کرد :-

[اللهم امنحنا اكتافهم .... اللهم اهزمهم ..... وانصرنا عليهم .... والحقني اليوم بنبيك] .

بەراء تەماشای برا خۆشەویستەکەی ئەنەس دەکرد .. بە تەمەشا کردنێکی درێژ دەتگووت ماڵ ئاوایی لێ دەکات .......
مسوڵمانەکان ئازایەتی یەکی وایان نیشان دا لە جیهان دا چەشنی نەبوو ... کە بووە هۆی سەرکەوتن ، سەرکەوتنێکی خوایی ...
بەلاّم لەناوەندی گۆڕەپانی جەنگ کە شەهیدەکان کەوتبوون ، بەرائیش لەگەڵ ئەم کۆمەڵە شەهیدە بوو ، ڕووەگەشە جوانەکەی بە زەردەخەنەوە ، وەک بزەی بەیانی ، دەستە پیرۆزەکانی پڕ بوو لە خۆڵی خوێناوی کە سوور ببوو بە خوێنی گەش وناڵی ...
شمشێرەکەشی لە تەک خۆی درێژ کردبوو .... بەسام وهەیبەتەکی زۆرەوە .. شەهید بەراء گەیشتە بەهەشتی خۆشی نەبڕاوەی خۆی وبەم جۆرە مەبەست ودروشمە پیرۆزەکەی : [ اللـه ، والجنـه ] هاتەدی و بەهەشتیش هەر لە دوورەوە بانگی بەرائی کردوو گووتی : [ان تلكم الجنة ، اورثتموها بما كنتم تعملون] ..

١٤

# عامیری کوڕی فەهیرە

## ئەو شەهیدەی فریشتەکان بە خاکیان سپارد

﴿١٤﴾

# عامیری کوڕی فەهیره

## ئەو شەهیدەی فریشتەکان بە خاکیان سپارد

ئەوەی گومانی تیانیە ئەوەیە ، ئاینی خوای گەورە ناپێوڕێت بە پێوانەی بنەماڵەو پلەو پایە ، وە ناکێشرێت بە کێشانەی ماڵ وسامان و یان جوانی ، بەڵکو پێوەری کێشانە لەلای خوا لەسەر دوو کۆڵەگە بەندە :ـ تەقواو کردەوەی چاک ، هەر کەسێک بڕوایی هێناو جیهادی کرد لەلای خوا بەرزە ، ئەگەر بەندەیەکی رەشی حەبەشی بێت ، وە ئەگەر لەخوا یاخی بوو و بێ بڕوا بوو ئەوا خراپترین چارە نووسی دەبێت ئەگەر گەورەیەکی قورەیشیش بێت :

(ان اکرمکم عند الله اتقاکم ، ان الله علیم خبیر)

وە ئەو ئەصحابە بەڕێزەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، لەم جۆرە بابەتە ئەم دەرسەمان دەداتێ کەوا لە ژێر بەندایەتی وکۆیلایەتی گەورە دەبێ و ، پاشان یەکێک لە پیاوچاکان چاکەیکی لەگەڵ دەکات و ئازادی دەکا ، هەروەها نازناویشی بەناوی دایکی دەبێت ، چونکە نەیتوانیوەو بۆی نەبووە ناوی باوکی یان مامی هەڵبگرێ ، لەبەر ئەوەی دایکیشی کۆیلە بووە ....

لەگەڵ ئەمەشدا لێهاتوو و بەتوانا بوو ، هەتا زۆر کەس خۆزگەی جێگای ئەویان دەخواست .. ئەم صەحابیە موجاهیدە شەهیدە یەکێکە لە مسوڵمانە سەرەتایەکان :ـ عامر کوڕی فەهیرەی ئەزدی تەمیمی ، فەهیرە ناوی دایکیەتی ، جاریەو کۆیلە بووە ، عامریش بەم جۆرە بە بەندایەتی و کۆیلایەتی گەورە بوو ، پاشان ئیمامی ئەبوبکر (خوا لێی ڕازی بێت) کڕیەوەو ، لەبەندایەتی ئازادی کرد .... بەم جۆرە عامر بووە سەرکاری ئیمامی ئەبوبەکر ، پاش ئەوەی ڕزگاری کرد لە ئازارێکی سەخت .

دەیچێشت بەدەستی ستەمکارە بێ بڕواکان ، بەهۆی مسوڵمان بوونی کەوا لەکاتێکی زوو ئاشکرای کرد پێش ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بچێتە ماڵی ئەرقەمی کوڕی ابی ئەرقەم.

لێرەدا عامر بە درێژایی ژیانی بە وەفاداری مایەوە بۆ ئیمامی ابوبەکر خاوەن چاکەی گەورە بوو لە گەڵی ... وە لەکاتی کۆچکردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ مەدینە ، عامر لەگەڵ ماڵی ئەبوبەکر بەشدار بوو بۆ خزمەتی پێغەمبەرو ئەبوبەکر کاتێک خۆیان حەشار دابوو لەناو ئەشکەوت ، (ئەسمای کچی ئەبوبەکر) (خوا لێی ڕازی بێت) خواردنی بۆ دەبردن ، عبد اللەی کوڕی ابوبکر دەنگ وباسی بۆ دەهێنان ، عامریش

کەوا شوانی ئیمامی ئەبوبەکر بوو لەگەڵ مەڕەکانی دەهاتە لای ئەشکەوتەکە ، بۆ ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە گەڵ ئیمامی ئەبوبەکر لەشیری مەڕەکان بخۆنەوە ، پاشان دەگەڕاوە شوێن پێی ئەسماو براکەی بە مەڕەکان دەسڕیەوە ، پاشان عامر لە گەڵ کۆچکردووەکان کۆچی کرد: پێغەمبەروئەبوبەکر ، بەم جۆرە شانازی هاوبەشی ئەم کۆچکردنەی بەدەست هێنا ، لە مەزنترین کۆچ لە ژیانی مرۆڤایەتیدا ....

سیرە بۆمان دەگێڕێتەوە کەوا کۆمەڵێک لە ئەصحابە کۆچکردووەکان توشی تایەک هاتن دوابەدوای کۆچکردنیان ، بە هۆی ئەم نەخۆشیەی بڵاوبیوۆوە لەشاری مەدینە ، تایەکە زۆری بۆهێنان ، لەوانە ئیمامی ئەبوبەکرو بیلال وعامری کوڕی فەهیرە ، تووشی ئەم تایە هاتن ، دایکی مسوڵمانان عائیشە دەگێڕێتەوە دەڵێت پرسیارم لە عامر کرد ئەو کاتەی تای هاتبویّ ، گووتم ، حاڵت چۆنە ئێستاکە ئەی عامر ؟ ..

وەلامی دایەوە ئەو کاتە ئازاری ئەم تایەی دەچێشت :-

لقد وجدت الموت قبل ذوقه ان الجبان حتفه من فوقه
كل امرئ مجاهد بطوقه كالثور يحمي جلده بروقه

کاتێک عائیشە ئەم دەنگ وباسەی دابە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :-

(اللهم حبب الينا المدينة كما حببت الينا مكة واشد) .

واتە :-خوایە مەدینەمان لەلا خۆشەویست بکە ، هەروەک مەکەت لەلا خۆشەویست کردبووین بەڵکو زیاتریش ..... پێغەمبەر ﷺ عامرو (حارث کوڕی صمه)ی کرد بە براو ئەم موجاهیدەش ئەوەبوو نیعمەتی شەهادەتی بەدەست هێنا لەگەڵ عامر لەیەک ڕۆژو لەیەک جەنگدا ....

عامر بەشداری جەنگی بەدری کرد ، جێگاو شوێنی زۆر بە چاکی دیار بوو ، هەروەها بەشداری جەنگی ئوحدیشی کرد ، ئەوە بوو بەرگەیەکی چاکی ئەم شەڕەشی کرد ، لە مانگی سەفەری ساڵی چواری کۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ پۆلێک گیان فیدای ڕەوانی شوێنێک کرد کە پێیان دەگووت (بئر معونة) ئەمەش کەوتبووە نێوان خاکی ئەوەی عامر و حوزەت ئەوەی سلیم ......

ئەم پۆلە موجاهیدەش پێک هاتبوو لە دەیەها موجاهید ، هەندێک دەڵێن ژمارەیان حەفتا کەس بووە ، هەندێکیان دەڵێن چل کەس بوون ، هەندێکیشیان دەڵێن سی کەس بوون ، ئەوانەش بەناویانگ بوون بە خواپەرست وخوێنەری قورئانی پیرۆز ،

کەوا بەشەو نوێژیان دەکردو قورئانیان دەخوێند ، وە بە ڕۆژیش کاروکاسبیان دەکرد وداریان خڕدە کردەوە ، یەکێک لەوانە قارەمانی خواپەرست عامری کوڕی فەهیرە بوو.
قەدەری خوای گەورە وەهابوو ئەم موجاهیدانە تووشی تاقیکردنەوەیەکی گەورە بـبن ، پلەی شەهادەت لە ڕێگای خودا بەدەست بهێنن ، خەڵکێکی زۆر لە (رعل و ذكوان وعصبة) بۆیان دەرچوون و ، بە خیانەت وغەدر گەورەترین ڕەشەکوژیان بۆ کردن ....
کاتێک موجاهیدان بینیان چارەنووسیان تەنها مردن و شەهید بوونە یەکێک لەوانە گووتی :- (خودایە ئێمە کەسمان نیە بینێرین بۆ ئەوەی سەلام بگەیەنێ بە پێغەمبەرەکەت ، سەلامی ئێمەی پێ ڕابگەیەنە .... خودایە بە پێغەمبەرەکەت ڕابگەیەنە ئێمە گەیشتین بە تۆو لە تۆ ڕازین و ، تۆش لە ئێمە ڕازی)
خوای گەورەش وەلامی دوعاکەی دانەوە ، چارەنووسی ئەوانی بە پێغەمبەرەکەی گەیاند ﷺ ، پێغەمبەر ﷺ ئەصحابەکانی کۆکردەوە و ، ئەم هەواڵەی دانێ ، پاشان فەرمووی :- من پێغەمبەرم لە لایەن خوا بۆ ئێوە ، ئەوانە لەخوای ڕازی بوون و ، خواش لەوانە ڕازی بوو ) ..
یەکێک لەوانەی لەم ڕۆژەدا تامی شەهادەتی چێشت قارەمانی موجاهید عامر کوڕی فەهیرە بوو ، پیاوێک بەناوی (جبار کوڕی سلمی الکلابی) ڕمێکی لێدا ، عامر کاتێک ڕمەکەی پێکەوت فەرمووی :- اللە اکبر ، فزت ورب الكعبە ...
جباری پیاوکوژ گوێی لەم عیبارەتانە بوو کە عامری شەهید بانگی پێدا ، لە ماناکەی نەگەیشت ...
بۆچی گووتی :- اللە اکبر ؟!
کانێ ئەو سەرکەوتنەی پێی سەرکەوت ؟
ئایا تامی مردنی نەچێشت و ژیانی کۆتایی پێ نەهات بۆ خۆڵ ؟
ئەم پیاوە ڕۆیشت پرسیاری کرد ، پێیان گووت مەبەستی عامر لەم ووشانە ئەوەیە خوای گەورە گەورەی کردووە بە نیعمەتی شەهادەت لەڕێگای خۆی ، ئەمە سەرکەوتووە بە خۆشی بەهەشت لە ڕۆژی دوایی ... (جبار) سەری سوڕما لەم بڕواییە بە تینە ، وای لێهات هەموو کات بیریکاتەوە ، دەتگووت عامر هەموو کاتێک لە دەوروبەری دەسوڕێتەوە و ، پەنجە پیرۆزە نورانیەکانی لێ هەڵدەشەقێنێ و ، پێی دەڵێ بەدەنگێکی وا ترسی ڕۆژیی دوایی لەناو بێت ، ئەی جەبار ، واز بهێنە لە بێ بڕوایی ویاخی بوونت ، دەرگا لە بەرامبەرت کراوەتەوە ، وەرە ناو ئاینی خوای گەورە و دێیتە ڕیزی سەرکەوتووەکان ..

خوای گەورە سینگی (جبار)ی بۆ ئیسلام گۆش کردو ، هیدایەتی داو بووە مسوڵمان ، لێیان پرسی دەربارەی هۆی مسوڵمان بوونی ، ئەوە بووە هۆی مسوڵمان بوونم من ڕمێکم لە کابرایەک دا بە نێوان شانەکانی کەوت ، تەماشام کرد ڕمەکە سەری لە سینگی دەرچووە ، گوێم لێبوو گووتی : الله اکبر ، فزت ورب الکعبە .... لە دڵی خۆم دا گووتم :۔ سەرکەوتنی چی ؟ ئایا ئەم پیاوەم نەکوشت ؟! هەتا پاشان پرسیارم کرد دەربارەی قسەی ئەم پیاوە ، گووتیان :۔ ئەوە مانای شەهادەتە ، خوای گەورە دڵی کردەوە بۆ ئیسلام وگووتم :۔ الله ، ڕاستی گووت ، و الله سەرکەوت !!.

ئیتر بەم جۆرە عامر شەهید بوو ۔ لە تەمەنی چل ساڵی ۔ بە ئامانجی خۆی گەیشت و گەیشت بە خۆشی هەتایی وپاداشتی بە بەهەشت درایەوەوبووە هۆی هیدایەت دانی یەکێک لە گاورەکان بۆ سەر ڕێگای خودا ، ...

یەکێک لەوانەی جەنگەکەی بە چاوی خۆی بینی ، لاشەی عامر کوڕی فەهیرەی بینی بەرزکراوە بۆ ئاسمان ، ئیمام زوهری دەڵێت :۔ وام پێ ڕاگەیەندراوە کەوا بەدوای لاشەی عامری کوڕی فەهیرە گەڕان نەیاندۆزیەوە ، واتەماشا دەکرێ فریشتە شاردبیانەوە ....

هەروەها ڕیوایەت دەکرێ کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :۔ (فریشتەکان لاشەی عامری کوڕی فەهیرەیان ناشت و ، وە دابەزێنرا بۆ شوێنی (علیین) . (علیون) شوێنێکی بەرزە و بەڕێزە بۆ خواپەرستەکان ، هەروەک قورئانی پیرۆز باسی دەکات : (کلا ، ان کتاب الابرار لفي علیین ، وما ادراك ما علیون ، کتاب مرقوم یشهده المقربون) . ئەم شوێنەی قورئان باسی دەکات (علیین) جێگایەکی بڵندو گەورەیە ، شوێن وجێگای فریشتەکانە ، ئەم شوێنە کردەوە چاکەکانی بەندە پیاو چاکەکانی لێ بەرز دەکرێتەوە ، ئەم شوێنە خۆشترین بڵندترین جێگایە ، لە هەموو شوێنێ لە خوا نزیکترە لە ڕۆژی دوایی ، هەر بۆیە فەرمووده دەڵێت: (خەڵکی بەهەشت تەماشای خەڵکی (علیین) دەکەن هەروەک تەماشای ئەستێرەی دوری دەکەن لەو پەڕی ئاسمان) ...

لەبەر ئەوە پێغەمبەر بۆ ماوەی یەک مانگ لە نوێژدا قنوتی خوێند ، دوعای لە دوژمنەکانی خوا کرد ئەوانەی ئەم ئەصحابانەیان شەهید کرد ، هەروەک ئەنەسی کوڕی مالیک دەگێڕێتەوە (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت : (نەمبینیوە پێغەمبەری خوا لەیەکێک تووڕە بێت وەکو ئەوانەی لەبیری مەعونە لێیان تووڕە بوو) ....

(سلاوی خوا لە گیانی پاکی شەهید عامری کوڕی فەهیرەو شەهیدانی بیری مەعونە)

١٥

# سەعدی کوڕی ڕەبیع

پەیام هەڵگری
خواو پێغەمبەر

## ﴿١٥﴾

# سەعدی کوڕی ڕەبیع

## پەیام هەڵگری خواو پێغەمبەر

یەکێک لەو ڕاستیانەی ئیسلام داتی پێداهێناوە جیهاد گەشە ناکاو بەرز نابێتەوە تەنها بەوە نەبێت ، لە نەخۆشیە دەروونیەکانی وەک ڕیایی ، بەڵام ئەگەر بەتەواوی بۆ خوا بێت ، وەک پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ دەفەرمووێت: (من قاتل لتكون كلمة الله هي العليا فهو في سبيل الله) . واتە : هەر کەسێک بجەنگێت بۆ بەرز کردنەوەی ووشەی (الله) ، ئەوا بەڕاستی بۆ ڕێگای خوایە .

کاتێک بڕوادار دەگاتە پلەو پایەی جیهاد هەست و نەستی خۆی لە بیردەکاو ئارەزووەکانی دونیاشی پشت گوێ دەخات ، بێجگە لە بیروباوەڕەکەی هیچی تری بە یادا نایەت و ، هەموو کاتێک دەیەوێت کارەکەی سەرکەوێ و گەشە بکات ، نیازیشی تەنها ڕەزامەندی خوای گەورەیە ، بەم جۆرە موجاهید سەرکەوتنێکی هەرە بەرزوە دەست دەهێنێ .

ئەوەش یەکێکە لەو تێکۆشەرانەی کەوا خوا بەڵێنی بەهەشتی پێ‌دا ، ئەوەش سەحابی موجاهید پێشەنگی شەهیدان شەهید سەعدی کوڕی ڕەبیعی کوڕی عەمری کوڕی زەهیری ئەنصاری .

هەروەها لەو شتانەی کە (سەعد) لە خەڵکی جیادەکردەوە ، خوێندەواری بوو ، چونکە عەرەب ئۆمەتێکی نەخوێندەوار بوون وپیاوی خوێندەواریان بەدەگمەن هەبوو ، لەبەر ئەوە سەعد بە چاوێکی زۆر ڕێزەوە سەیر دەکرا .

هەر لە زووەوە دڵە گەورەکەی سەعد ڕووناک بۆوە بە ڕێگای هیدایەت ، یەکێک بوو لەوانەی لە پەیمانی عەقەبەی دووەم بەشداری کردو ، پێغەمبەر ﷺ دەرهەق بەم دەستە پێشەنگە موسڵمانانەی خەڵکی مەدینە کە بەشدار بوون لە پەیمانی عەقەبەی دووەم فەرمووی :-

(پەیمانم لەگەڵ دەبەستن لەسەر گوێ ڕایەڵی لە خۆشی ناخۆشی و ، ماڵ بەخشین لەکاتی هات ونەهاتی ، وەفەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپە ، وەشتێکیش بۆ خوا بێت بیڵێن و نەترسن لە لۆمەی لۆمەکەران ، وەپشتگیریم بکەن و ئەم نایەنە بپارێزن

هەروەک ماڵ و منداڵ و شەرەفی خۆتان دەپارێزن ، خوای گەورەش بەهەشتتان پێ دەبەخشێ) .
خەڵکەکەش هەڵسان و موبایەعەی پێغەمبەری خوایان کرد ﷺ لەسەر ئەوە ، چەند جار دووپاتی وەفاداریان کردەوە بۆ ئەو پەیمانە . پاش ئەم گفت وگۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی :ـ (لە ئێوە با دوانزە پێشەنگ (نقیب) بێتە دەرەوە ، بۆ ئەوەی لەسەر خێڵەکەیان بین بە کەفیل) . سەعدی کوڕی ڕەبیعیش یەکێک بوو لەو دوانزە پێشەنگە ، پێغەمبەر ﷺ بەم پێشەنگانەی فەرموو : (ئێوە لەسەر میللەتەکەتان دەبن بە کەفیل هەروەک کەفالەتی حەواریەکان بۆ عیسای کوڕی مەریەم ، وە منیش کەفیلم لەسەر میللەتەکەم) .
هەروەها سەعدی کوڕی ڕەبیع یەکێک بوو لەوانەی کەوا پەتکی حوشتری پێغەمبەری گرت ، لەو کاتەی پێی نایە خاکی مەدینە ، پێشنیاری ئەوەی کرد کە پێغەمبەری خوا ببێت بە میوانی ، بەڵام پێغەمبەر ﷺ بە یاریدەدەرەکانی مەدینەی فەرموو :ـ لەم حوشترە گەڕێن لە لایەن خواوە فەرمانی پێ کراوە .
پێغەمبەر ﷺ سەعد و عبدالرحمن کوڕی عەوفی کرد بەبرا ، سەعد پێشنیاری کرد کەوا ماڵەکەی لەگەڵ بکات بەدوو بەشەوە ، هەروەها یەکێک لە دوو خێزانەکانی بۆ (طلاق) بدات ، ئای لەو ئیمانە بەرزەی سەعد چۆن ئیمانێکە ، ئەوەش نیشانەی دونیا نەویستنی سەعد بوو ، دڵسۆزی بوو بۆ ئیسلام و بەرنامەکەی ، بەڵام باگوێش بگرین لە وەڵامی عبدالرحمن هەزار رەحمەتی خوای لی بێت :ـ سوپاس بۆ هەستی بەرزت ئەی سەعد ، خوای گەورە پیت وبەرەکەت بخاتە ناو ماڵ وخێزانەکانت ، وەرە تۆ ڕێگای بازاڕم پێ نیشان بدە . ئەوە بوو عبدالرحمن چووە بازاڕ ، بازرگانی کردو قازانجی کرد ، تاکو بووە خاوەن ماڵ وجاهێکی گەورەو دەوڵەمەند بوو .
ئنجا ژیانی جیهادی سەعدی کوڕی ڕەبیع دەستی پێ کرد بە غەزای بەدر ، سەعد شەرەفی بەشداری وەرگرت و بەراستی جیهادی بۆ خوا کرد ، پاشان دووبارە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بەشداری غەزای ئوحدیشی کرد ، بەبێ ئەوەی سستی و کەم وکورتی هەبێت ، بەڵکو پێشەنگی تەواو ڕاستگۆو ئارامگر دەرچوو لە جیهادەکەی ، هەروەها خۆشی بەرەنگاری هەموو لێدانێک کرد لە ڕاست وچەپ ، بەڵام لە گەڵ ئەوەش توانی بەهەمان شێوە لە دوژمنەکەی بداو بەڵکو زیاتریش .

پێغەمبەر ﷺ لەو هەڵوێستە ناخۆشە بەزەیی بە سەعدا هاتەوە لەوکاتەی تۆزو خۆڵ غەزای ئوحد بەری ئاسمانی گرتبوو ، هەتا پێغەمبەریش ﷺ خۆشی برینداری ئەم جەنگە بوو ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ئایا کەس هەواڵی سەعدی کوڕی ڕەبیع دەزانێ ؟ دەبێ لە زیندوەکانەبێ یا لە مردوەکان !! من دیم هەموو تیرەکان بە ئاڕاستەی ئەو بوون .

یەکێک لە یاریدەدەرەکان ئوبەی کوڕی کەعب گووتی :ـ من دەچم بۆ سۆراغی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ئەگەر بینیت سەلامی منی پێ ڕابگەیەنەوە هەواڵی بپرسە !!

ئوبەی کوڕی کەعب سەعدی دۆزیەوە بەڵام چ دۆزینەوەیەک سەعد لەناو خوێنی کاڵی دا گەوزیبوو ، لە ئاخرو ئۆخری ڕۆحی دا بوو ، ئوبەی کوڕی کەعب پێی گووت :ـ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمری پێ کردووم سەلامی ئەویت پێ ڕابگەیەنم ، سۆراغت بزانم لە زیندوەکانی یان لە مردووەکان . . .

سەعد گووتی :ـ سەلام لە پێغەمبەری خوا بێت .. من لە مردووەکانم دوانزە تیرم پێکەو تووە ، هەر دوانزەشیان برینی قوڵن .

ئەوا سەلامی پێغەمبەرم پێ گەیشت وپێی بڵێ سەعدی کوڕی ڕەبیع دەڵێ: خوا پاداشتی خێری بداتەوە بەوەی هیچ پێغەمبەرێک پاداشتی نەدرابێتەوە .. وە سەلامی من بە خەڵک ڕابگەیەنە و پێیان بڵێ سەعدی کوڕی ڕەبیع پێتان دەڵێ : هیچ پاساوێک وعوزرێکتان نیە لەلای خوا بەئەندازەی یەک چاو تورکاندن لە پێغەمبەرەکەتان بێ ئاگابن .

دووبارە سەعد بە کوڕی کەعبی فەرموو : سەلامی من بە خێڵەکەم ڕابگەیەنە پێیان بڵێ :ـ سەعد پێتان دەڵێ:ـ لە خوا بترسن ، لە خوا بترسن لەو بەڵێن و پەیمانەی لەگەڵ پێغەمبەرتان دا شەوی عەقەبە ، واللە هیچ پاساوێکتان لای خوا نیەوهیچ عوزرێکتان نی یە ئەگەر پیغەمبەری خوا بکوژرێ و یەک کەسیش لە ئێوە زیندوو بێت. هەر ئەوە بوو پاش چەند ساتێک ڕۆحی پاکی سەعد بەرزبۆوە بۆلای خوای گەورەو ئوبەی کوڕی کەعبیش لە تەنیشتی بوو .

ئوبەی کوڕی کەعب گەڕاوە لای پێغەمبەر ﷺ ڕاسپاردەکانی پێشەنگی موجاهیدان شەهید سەعدی بە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاگەیاند:ـ پێغەمبەر ﷺ زۆر

کاری لیٚ کردو ڕەحمەتی خوای بۆ ڕەوانەکرد فەرمووی : بەڕاستی ڕاستگۆو دڵسۆز بوو بۆ خوا پێغەمبەرەکەی بە زیندوویی و مردوویی .

بەم جۆرە هیچ شتێک نەبوو لە دونیا سەعدی کوڕی ڕەبیع مەشغول بکات ، ئەوە بوو لە کۆتایی نەفسی ژیانی ،لە سەلامەتی و لەش ساغی پیغەمبەری خوای پرسی ، چونکە یەکەم بانگەوازکار بوو لە ئیسلام و ... پەیام نێری خوای گەورە بوو ، هەموو کاتێک کافرەکان هەولی شەهیدکردنی ئەویان دەدا ، بە نیەتی خۆیان مۆمی ڕۆناکی خوای گەورە بکوژێننەوە . بەڵام ئەوان خەونی حوشتریان دەبینی بۆ ئەم مەبەستە گلاوەیان چونکە خوای گەورە پارێزەری ئەم ئیسلامەیەو رۆحی پیغەمبەرو هەموو مرۆڤێک تەنها بەدەستی ئەوە ، لاشەی سەعدی کوڕی ڕەبیع وخارجە کوڕی زەید کوڕی ئەبی زوهەیر لە یەک قەبر نێژران.

سەعد خوا لیی ڕازی بێت لەدوای خۆی هەندێک ماڵی بەجیٚ هێشت لەگەڵ دووکچ و خێزانی ... بەڵام مامی کچەکان بەداب و نەریتی جاهیلی دەستی بەسەر ماڵەکە داگرت و وای دەزانی مافی ئەوە ، برایانی بەڕێز ئەوە بوو ڕێزی ئافرەت لە پێش ئیسلام بەم جۆرە دەچەوسایەوە و ستەمی لی دەکرا .... ئەوە بوو خێزانی سەعد دەستی هەردوو کچەکانی گرت و چووە لای پیغەمبەری خوا ﷺ پیی گوت :.ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم دوو کچە کچی سەعدی کوڕی ڕەبیعن باوکیان لەگەڵ ئێوەکوژراوەو لە شەڕی ئوحد شەهید بووە ، مامیشیان ماڵەکەی بردوون و هیچ شتێکیان بۆ بەجیٚ نەماوە ، ئەوانە ناتوانن شوو بکەن ئەگەر بەماڵ نەبیٚ . پێغەمبەر ﷺ فەرمووی :.خوای گەورە دادوەرە لەم کێشەیەدا . پاش کەمێک ئایەتی میرات هات خوارەوە و پێغەمبەر ﷺ لە دوای مامی کچەکانی ناردو پیی گووت :.دوو سیٚ یەکی ماڵەکە بدە بە کچەکان ئەوی ماوە بۆ خۆت .

چەند ساڵ و ڕۆژانێک ڕۆیشت ، ئەبوبەکری صەدیق بوو بە خەلیفەی موسڵمانان ڕۆژێک کچی سەعد هاتە لای ئەبوبەکرو ئەویش بۆی هەڵساوە و ڕێزی لیٚ نا ، وە عەباکەی خۆی ڕاخست بۆی بۆ ئەوەی لەسەری دابنیشیٚ ، پاشان عومەری کوڕی خەتاب هاتە لای و ، ئەبوبەکر پیی فەرموو : .ئەوە کچی پیاوێکە لە من وتۆ باشترە؟!.

ئیمامی عومـەر فـەرمووی : ئەوەکێـیە ئەی خەلیفەی پێغەمبـەر ﷺ ؟ ئیمـامی ئەبوبەکر وەڵامی دایەوە :- پیاوێکە جێگای لە بەهەشت بۆ تەرخان کـراوە ، تـەنها مـن وتۆش ماوین ، ئەوانە کچی سەعدی کوڕی رەبیعن. عومەریش بەخێرهاتنێکی گەرمی لێ کردن و هەمان ڕێزی لێنان .

رەحمەتی خوا لە سەعدی کوڕی رەبیع و هەموو شەهیدانی ئیسلام.

١٦

## عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی حەرام
(باوکی جابر)

ئەو شەهیدەی خوای گەورە
گفت وگۆی لەگەڵ کرد

﴿١٦﴾

# عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی حەرام

## (باوکی جابر)

## ئەو شەهیدەی خوای گەورە گفت وگۆی لەگەڵ کرد

ئەمەش یەکێکە لە کەڵە پیاوانی ئیسلام ، وە یەکێکە لە گەورە پیاوە ناودارە یاریدەدەرە موجاهیدەکان ، ئەوەش ئەصحابەی بەڕێزی تێکۆشەر : باوکی جابر عەبدوڵای کوری عەمری کوری حەرامە ، زۆر بە ئاسانی بوو بە موسڵمان وبەرەو پیری ئیمان هات ، هەندێک لەو یاریدەدەرانەی ببوون بە موسڵمان ، هاتنە لای (باوکی جابر) پێیان گووت : ئەی باوکی جابر. تۆ یەکێکی لە گەورە پیاوانی ئێمە ، بەڕاستی پێمان ناخۆشە ئەوەی تۆ لەسەری ، ئامانەوێ سبەینێ ببیە سوتەمەنی ئاگر لە ڕۆژی دوایی .

باوکی جابر ئەوە بوو چەند چرکەیەکی ئەبرد بیری لە خۆی کردەوە ، سنگی گوشاد بوو بۆ بانگی خوداو باشترین ژیان ، وە بەشداری پەیمانی عەقەبەی کرد ، یەکێک بوو لە پێشەنگەکان ، بەم جۆرە دەروونی پاک وخاوێن ، هیچ ماندو بوون وناخۆشیەکی ناوێت بۆ بانگەواز کردن بۆ ڕێگای خێر و هیدایەت ، لەبەر ئەوەی هەموو منداڵێک لە دایک دەبێت لەسەر فیترەتێکی پاک ، ئەگەر هاتوو ئەم فیترەتە ژەنگ وژاڵی ئارەزووەکانی لەگەڵ تێکەڵ نەبێ ، شێلو نەبێت .... پیاوی بەڕێزو چاک لە نەفامیدا کاتێ دێتە ناو ئیسلام . ئەوا باشترو چاکتر دەبێ .

یەکەمین تاقیکردنەوە بۆ بازرگانی خۆبە کوشت دان هاتە پێشەوە ، جەنگی بەدری گەورە بوو ، کەوا باوکی جابر لەگەڵ پێغەمبەرەکەی ﷺ تێیدا بەشدار بوون بەوپەڕی چاکی و وەفاداری .

پاشان جەنگی ئوحد هاتە پێش کەوا جەنگێکی زۆر خوێناوی ناخۆش بوو ، پاش ئەوەی هەندێک لەو پیاوانەی شوێنی خۆیان بەجێ هێشت لە بەرزاییەکاندا ، بەم جۆرە فەرمانی پێغەمبەریان ﷺ شکاند ، ئەمەش بووە هۆی شکانی لەشکری موسڵمانان و ،بەم جۆرە موسڵمانان کەوتنە بارێکی زۆر ناخۆش ، وادەگێڕنەوە هەندێک لە یاریدەدەرکان لەم ڕۆژەدا بە پێغەمبەریان ﷺ گووت :

ئەي پێغەمبەری خوا ئایا داوای یارمەتی لە هاوپەیانە جوولەکەکان نەکەین ؟ ئەویش وەلامی دانەوە گووتی: پێویستیمان بە ئەوان نیە.

دەتگوت گەورەی پێغەمبەران ﷺ لە دڵی ناوە ئەم چینە چاک نابن و ڕێگای ڕاست ناگرن ، وە ئەو جولەکانە پاش ماوەیەک دڵە ڕەنگاویەکانیان بەدیار کەوت و کەچ جۆرە نیازو مەبەستێکی گڵاویان هەبوو بەرامبەر مسوڵمانان ، چونکە ئەم جولەکانە دەست و دەروون پاک نین و هەر چەندە چاکەیان لەگەڵ بکەیت ئەوان منەتیان پێ نیە ، لەبەر ئەوەی دڵیان لە شاخ ڕەقترەو هیچ شتێک لەم گومڕاییە نایان گێڕێتەوە تەنها هێزی کوتەک و لێدان نەبێ ، دەڵێی زمانی قەدەر حوکمی لەسەر کردوون پێش هەزارو چوارسەد ساڵ کەوا جولەکە شایانی ئەوە نین پیاوەتی و هاوکاریان لەگەڵ بکرێت ، چونکە جولەکە میللەتێکی گومڕاو بێ ڕێزن ...... ڕێز بۆ هیچ میللەتێک دانانێن ، بەڵکو خۆیان بەگەورەی میللەتان دەزانن ..........

. وادەگێڕنەوە گومڕای دووڕوو عەبدولای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول ، لەجەنگی ئوحد بەخۆو بە سێیەکی خەڵکەکە گەڕانەوە ، بۆ ئەوەی مسوڵمانان سەرشۆڕو زەلیل بکەن ، ئەوە بوو خەڵکێکی دووڕوو بە گوێیان کردو ، لەم کاتەدا عەبدولای کوڕی عەمری کوڕی حەرام تووشیان بوو بانگی کردن وپێی گووتن : (بۆ خوا پێتان دەڵێم وبە بیرتان دەهێنمەوە کەوا میللەتەکەتان و پێغەمبەرەکەتان ڕیسوامەکەن ، وەرن لە پێناوی خوا شەڕ بکەن ، بەرگری بکەن) بەلام دووڕووەکان گوێیان پێ نەدا .

وا ڕیوایەت دەکەن لەسەر ئەم مەسەلەیە ئەم ئایەتانە هاتوونەتە خوارەوە لە سوڕەتی ال عمران: (وما اصابكم يوم التقى الجمعان فباذن اللـه ، وليعلم المؤمنين ، وليعلم الذين نافقوا وقيل لهم تعالوا قاتلوا في سبيل اللـه او ادفعوا . قالوا لو نعلم قتالا لاتبعناكم ، هم للكفر يومئذ اقرب منهم للايمان ، يقولون بافواههم ماليس في قلوبهم ، والله اعلم بما يكتمون ، الذين قالوا لاخوانهم وقعدوا لو اطاعونا ما قتلوا قل فادرأوا عن انفسكم الموت ان كنتم صادقين) .

هەروەها باوکی جابر حەوت کچی هەبوو ، ئاواتی هەرە گەورەی ئەوە بوو وەکو هەموو باوکێک ژیانێکی خۆش وبەختەوەرانە بۆ کچەکانی بەدی بهێنێت ، لەو کاتەی ویستی بچێت بۆ جەنگی ئوحد بانگی جابری کردوو پێی گووت : ئەی جابر ، خۆم وادێتە پێش چاو بکوژێم و یەکەم کەس بم لە کوژراوەکانی ئەم جەنگە ، لەبەر ئەوە من

کەس لە تۆ خۆشەویست تر بەجێ ناهێڵم جگە لە پێغەمبەری خوا ﷺ ، وەهەندێک قەرزارم وقەزەکەم بۆ بدەوە و ئامۆژگاریت دەکەم لەگەڵ خوشکەکانت باش بیت .

سبحان الله لەبەر ئیمانی باوکی جابر ... ئەو پیاوەی لێپرسراوە لەسەر خێزانێک زۆربەیان کچن ، لەگەڵ ئەوەش دوو دڵی ناکات بۆ دەرچوونی بۆ جیهاد ، لەبەر ئەوەی ئەرکی جیهاد لە هەموو ئەرکەکان گرنگترە .... وا هەست دەکا وەک ئەوەی خوا لە دڵی نابێ ببێتە یەکەم شەهیدی ئەم جەنگە ، لەگەڵ ئەوەش پێغەمبەری خوای لەلا خۆشەویسترە هەتا لە منداڵەکانیشی ، لەبەر ئەوەی ئەم پێغەمبەرە خۆشەویستە سەبەبی هەموو خێرو نیعمەتێکە ، وە پێشەوای هەموو بانگەوازکار و موجاهیدانی ڕێگای خوایە .....

هەروەها عەبدوڵا وەفای هەیە بۆ ئەو کەسانەی قەرزی لێ وەرگرتینەو کەم تەرخەمی ناکات لەو وەعدو بەڵێنانەی کە لەگەڵی بەستونە ، بەڵکو لەپاش خۆی وەسیەت دەکا بۆ کوڕەکەی و کەوا قەرزەکانی بۆ بداتەوە ، ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکات کەوا لەگەڵ خوشکەکانی باش بێت و بەهیچ جۆرێک ستەمیان لێ نەکرێت وهەر یەکەیان بچێتە ڕێگای خۆی .

پاش ئەم هەموو ئامۆژگاری و وەسیەتنامەیە (عبدالله) ماڵ ئاوایی لە کوڕەکەی جابر دەکاو وەکو پڵینگ ئاسا بەرەو مەیدانی جەنگ دەڕواو ، دەڵێی پێیان گوتووە لە غەیبەوە .... بە ڕاستی قسەکەت ڕاست بوو و ، بوویە یەکەم شەهیدی ئەم جەنگە ، کە جەنگی ئوحدە یەکەم خوێن بوو ئەم جەنگەی پێ ڕازاوە ، لە پاش ئەویش حەفتا شەهیدی تر لە کۆچکەران و یاریدەدەران گیانی پاکیان تەسلیم بەخوای گەورەکرد. بەڕاستی ئەم پیاوانە خۆیان ماندوو کرد بۆ گەیاندنی ئەم تیشکە بە مسوڵمانان ، یەکەم دەوڵەتی ئیسلام بە خوێنی ئاڵی ئەم شەهیدانە دروست بوو ، ئێمەش هەتاکو ماوین قەرزاری خوێنی ئەم شەهیدانەین کە بوونە هۆی هیدایەت دانی ملیۆنەها خەڵک لەسەر ڕووی زەمین بە ڕاستی ئەگەر بە قەدەر هەموو شاخەکانی کوردستان زێڕ بەخت بکەین ناگەینە کردەوە و گەورەیی ئەوان .

هەروەها گاورەکان لەبەر ئەوەی بێ بەرنامەن و بەرنامەکانیان دەستکردی مرۆڤن و پێش هەموو شتێک ئەو دروشم و مەبەستانەی بۆ داوا دەکەن وەکو ئازادی و مافی مرۆڤ ڕاست ناکەن و درۆ دەکەن ، ئەوە بوو پاش شەهیدکردنی ئەم کەڵە پیاوەی ئیسلام ، باوکی جابر لاشەکەی ناشیرین دەکەن و گەمەی پێ دەکەن ، لووت و گوێی

دەبرن ، پاش ئەوەی جابر تووشی لاشەی باوکی دەبێت مسولمانان دایان پۆشیوە بە پارچە قوماشێ ، جابر چووە لای و ئەم پەردەی لەسەر رووی پیرۆزی لادا ، ئەو کردەوە ناشیرینەی بینی کە دوژمنانی خواو پێغەمبەر بە باوکی خۆشەویستیان کردووە ، ناتوانێ فرمێسک لە چاوەکانی ڕابوەستێنێ و دەست بە گریان دەکا . موجاهیدەکان نایە لێ بگریێ و بەلام پێغەمبەری خوا قەدەغەی ناکات .

پاشان پوری جابر دێتە لای ، چاوی بە براشیرینەکەی دەکەوێ کە بە چ جۆرێ شەهید کراوە ، لێرەدا پێغەمبەری خوا پێی دەفەرموێ: (بگریێ یان نەگریێ تاکو ئێستا فریشتەکان سێبەریان لێ کردووە تاکو ئێوە هەلتان گرت) .

وەسێبەر لێ کردنی فریشتەکان لەسەر لاشەی باوکی جابر نیشانەی گەورەیی و بەرزی مەقامی عەبدولایە لای خوای گەورە (خوا لێی ڕازی بێت).

وەیەکێک لەو کەرامەتانەی شەهید عەبدولا ئەوە بوو کەوا باوکی جابر کاتێک برینێکی لەسەر رووی بوو ، دەستی پیرۆزی لەسەر برینەکە دانا بوو ، پاشان خەلکەکە هاتن دەستیان لابرد لەسەر برینەکە ، خوێن لە برینەکە دەڕۆیشت ، بەلام هەر کاتێک دەیان بردەوە شوێنی خۆی خوێنەکە ڕادەوەستا .

پاش ئەوەی جابر تۆزێک ئارامی هاتەوە ناو دلی و خوای گەورە سەبوری دا ـ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ئەی جابر ، مزگێنیت بدەمێ . جابر گووتی : بەلێ .... خوا مزگێنی خێرم بداتێ ، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ...!!

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : وا ئاگادار کرامەوە لای خوای گەورە ، خوای گەورە باوکتی زیندوو کردۆتەوەو پێی گوتووە : داوام لێ بکە ئەی بەندەم ئەوەی حەزی لێ دەکەی .. بەلام باوکت گووتی : ئەی پەروەردگار ، بەتەواوی تۆم پەرستووە ، داوام لێت ئەوەیە بمگێڕیەوە دونیا لەگەل پێغەمبەرەکەت ﷺ بچمەوە بۆ جەنگ ، دووبارە شەهید ببمەوە ... بەلام خوای گەورە پێی فەرموو :ـ ئەوە بەلێنی منە ، ئەوەی گەڕاوە لای من جارێکی تر گەڕانەوە بۆنیە.

هەروەها ئاواتی باوکی جابر تەنها ئەوە بوو تامی شیرینی شەهادەت بچێژێ ، نەک جارێک ، بەلکو چەندەها جار ، لەبەر ئەوەی ئەم شەهیدە قوتابی قوتابخانەی پێغەمبەر بوو ، پێغەمبەر ﷺ مامۆستاو رێ پیشاندەری بوو ، هەروەک پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو : بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە حەزدەکەم شەر بکەم وبکوژرێم ، لەبەر ئەوە کەس نیە بچێتە بەهەشت و حەزبکات بگەرێتەوە بۆ دونیا ، تەنها شەهید نەبێت

، داوا دەکات لە خوای گەورە بیگێڕێتەوە بۆ دونیا دەیەها جار شەهید بێ ، کە دەبینێ لەو ڕێزەی لێی گیراوە.

پاش ماوەیەک پێغەمبەر ﷺ چاوی بە جابر دەکەوێت و ، دەبینیت بیردەکاتەوە و خەمبارە ، پێغەمبەر ﷺ پێی دەفەرموێت : دەبینم خەمباریت ؟! جابر وەڵام دەداتەوە دەڵێ :- ئەی پێغەمبەری خوا ... باوکم کوژراوەو قەرزارەو کۆمەڵێک خێزانی لەپاش خۆی بەجێ هێشتووە ....

پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو : خەبەرەکت بدەمێ ؟ (خوا گەورە لەگەڵ هەر کەسێک قسەی کردبێ لە پشتەوەی پەردە قسەی لەگەڵ کردووە ، بەڵام لەگەڵ باوکت بەبێ پەردە .. پاشان خوای گەورە پێی گووت: داوام لێبکە بدەمێ ؟!.

باوکت وەڵامی داوەو گووتی : داوام ئەوەیە بمگێڕیەوە دونیا .... دووبارە بکوژرێمەوە . خوای گەورە پێی فەرموو : بەڕاستی پێش ئێستا ئەوەم گووتووە :- ئەوەی بمرێ گەڕانەوەی بۆ نیە . باوکت بەخوای گەورەی گووت : ئەی پەروەردگار ، بەوانەی پاشە من بڵێ ... خوای گەورەش ئەم ئایەتەی هێنا خوارەوە :-

(ولاتحسبن الذين قتلوا في سبيل الله امواتا بل احياء عند ربهم يرزقون ، فرحين بما اتاهم الله من فضله ويستبشرون بالذين لم يلحقوا بهم من خلفهم الا خوف عليهم ولاهم يحزنون ، يستبشرون بنعمة الله وفضله ، وان الله لا يضيع اجر المؤمنين) .

پێغەمبەر خوا ﷺ فەرمانی کرد بە ناشتنی باوکی جابر لەگەڵ هاوڕێیە خۆشەویستەکەی عەمری کوڕی جەموح لە یەک گۆڕ ، لەبەر ئەوەی ئەم دوو هاوڕێیە بۆ خوا هاوڕێ یەکتر بوون دڵ و دەروونیان لەگەڵ یەک پاک بوو ئەوە بوو هاوڕێی شەهادەت و جیهادیش بوون .

پێغەمبەر خوا ﷺ دەفەرمووێت :- (المرء مع من احب يوم القيامة)

واتە :- مرۆڤ لەگەڵ ئەو کەسە دەبێت ڕۆژی قیامەت کە لە دونیا خۆشی ویستووە ... ئنجا ئەی برای بڕوادار ئاگاداری خۆت بە لە دونیا ، یەکێکت خۆش بوێت بۆ خوا خۆشت بوێت ، لە دونیاش لەگەڵ چ کۆمەڵ و خەڵکێک بی .... ئەوا لە ڕۆژی دونیا لە ژێر بەیداخی ئەو ، خوای گەورە کۆتان دەکاتەوە ... لەبەر ئەوە ژیانتان بۆ خوا بێت و مردنیشتان هەر بۆ خوابێت .

پێغەمبەری خوا ئەمەی لەپێش چاو بوو دەیزانی (عەمری کوڕی جەموح) یش یەکێک بوو لەوانەی کەوا ژیانی دونیای لە لا زۆر کەم بوو ، لەگەڵ ئەوەی سەرۆک هۆز بوو ، یەکێک بوو لە پیاوە ناودارەکانی هۆزەکەی ، لە کاتی پاڕانەوەشی ئەم دوعایەی دەکرد بەرامبەر خوا : (اللهم ارزقني الشهادة في سبيلك....) . تاکو وای لی هات ئەم پیاوە پلەو پایەی ئەوەندە بەرز بۆوە لای خوا ، پێغەمبەر ﷺ دەرهەقی فەرموو :. بەو خوایەی گیانی منە بەدەستە ، ئەگەر سوێند بخوات لەسەر خوای گەورە ، خوای گەورە دوعاکەی قەبول دەکات.

ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ فەرمووی :. بینیم عەمر بە پێ شکستەکەی لە بەهەشت بوو . ڕەزای خوا لە باوکی جابر شەهیدی یەکەم ڕۆژی ناخۆشی :. ڕۆژی ئوحد ، پێشەنگی حەفتا ئەصحابەی شەهید ، داوای شەهیدی کرد لە دونیا ... هەروەها لە پاش شەهید بوونیش هەر داوای شەهادەتی کرد ... سڵاوی خوای گەورە لە شەهیدانی ئوحد ئەو شەهیدانەی بە تەواوی جیهادی خوایان کرد ... تا مردن سوور بوون لەسەر شەهید بوون ، هەر ئەوانە بوون بەندەکانی خوایان فێری جیهاد کرد ، ژیانیان پڕ بوو لە تێکۆشان و خۆ بە قوربانی دان .... هەر کاتێک پێغەمبەری خوا بەلای گۆڕەکانیان تێ دەپەڕی دەیفەرموو : (السلام عليكم بما صبرتم فنعم عقبى الدار) . ئەم ڕێگایەش خەلیفەکان (ابو بكر و عمر و عثمان و علی)یش گرتیانە بەر خوا لە هەموان ڕازی بێت . هەروەها خوای گەورە باسی (عقبى الدار) دەکات ، لە بەر ئەوەی ئەم چەشنە مسوڵمانانە جیهادیان بە تەواوی بۆ خوا کردو ، وەفایان هەبوو بۆ خواو پێغەمبەرەکەیان ، وە ئارامیان گرت هەروەک خوای گەورە لە سوورەتی (الرعد) باسی ئەم تەرزە بڕوادارانە دەکات و دەفەرموێت: (بسم الله الرحمن الرحيم ... أفمن يعلم أنما انزل اليك من ربك الحق كمن هو اعمى انما يتذكر أولوا الالباب •الذين يوفون بعهد الله ولاينقضون الميثاق• والذين يصلون ما امر الله به ان يوصل ويخشون ربهم ويخافون سوء الحساب•والذين صبروا ابتغاء وجه ربهم واقاموا الصلاة وانفقوا مما رزقناهم سراً وعلانية ويدرعون بالحسنة السيئة اولئك لهم عقبى الدار• جنات عدن يدخلونها ومن صلح من آبائهم وازواجهم وذرياتهم والملائكة يدخلون عليهم من كل باب• سلام عليكم بما صبرتم فنعم عقبى الدار)...

١٧

# عەمری کوڕی جەموح

دەمەوێت لە بەهەشت بەم
شکستیەم هەنگاو بنێم

﴿١٧﴾

# عەمری کوڕی جەموح

## دەمەوێت لە بەهەشت بەم شکستیەم هەنگاو بنێم

گیان بەخشین لەڕێگای خوا لوتکەی هەرەبەرزی جیهادە ، وەهەر بەجیهادیش سەرکەوتن بەدەست دێت ، قورئانی پیرۆزیش ئەم ڕاستیەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە ، ئەگەر جیهاد سستی لی بکرێت دەبێتە هۆی سزای خوای گەورە ، هەروەک دەفەرموێت:- (یا ایها الذین امنوا مالکم اذا قیل لکم انفروا في سبیل الله اثاقلتم الی الارض ؟ ارضیتم بالحیاة الدنیا عن الاخرة؟ فما متاع الحیاة الدنیا في الاخرة الا قلیل، الا تنفروا یعذبکم عذابا الیما، ویستبدل قوما غیرکم ولا تضروه شیئا ، والله علی کل شيء قدیر) .

پاش ئەمە خوای گەورە داوای نەفیر عام لە مسوڵمانان دەکا بۆ جیهاد ، تا سەرکەوتن دێتەجێ هەروەک دەفەرموێت :- (انفروا خفافا وثقالا ، وجاهدوا باموالکم وانفسکم في سبیل الله ذلکم خیر لکم ان کنتم تعلمون) .

بڕوادارانی قوتابیانی قورئان و پێغەمبەر بە تەواوی لە مانای جیهاد گەیشتن و ، ڕێگای جیهادیان گرت بۆ گەیشتن بە عیزەت وکەرامەت ، بەخۆیان و ڕۆڵەکانیان هەتا توانیان تێکۆشان ، وە داواکردنی یەکێک لەم دوو سەرکەوتنانە :-ژیان بە عیزەت وئازادی ، یاخود مردن و گەیشتن بە پلەی شەهادەت .

ئەوەش یەکێکە لەو صەحابیە بەڕێزانەی پێغەمبەر ﷺ ئەویش تێکۆشەری شەهید (عەمری کوڕی جەموح) ، کەوا یەکێک لە گەورە پیاوانی عەرەب ، سەرۆکی هۆزی (بني سلمه) بوو ، هەتا پێغەمبەر ﷺ بە هۆزەکەی گووتن :- [گەورەتان عەمری کوڕی جەموح] .

هەروەک مێژووی ئیسلامی بۆمان دەگێڕێتەوە ڕۆژێک پێغەمبەر ﷺ ڕووی کردە چەند پیاوێکی ئەم هۆزە ، فەرمووی : کێ گەورەتانە ئەی بني سلمه ؟

وەڵامیان داوە گووتیان : گەورەمان . ئەلجەدو کوڕی قەیس ، هەرچەندە پیاوێکی زۆر ڕەزیلە . پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:- ئایا چ دەردێک هەیە لە ڕەزیلی گەورەتر؟ بەڕاستی گەورەی ئێوە پیاوی ڕەوشت بەرز (عەمری کوڕی جەموح)ە.

ئەو باسەش وادەگەیەنی کە عەمری کوڕی جەموح سەرەڕای ئازایەتی پیاوێکی سەخی و دڵفرەوان و چاوتێر بووە ، بێجگە لەوەی گیان و ژیانی لەناو دەستی بووە بۆ ئەوەی پێشکەش بەخوای گەورەی بکا ، هەروەها هیچ کاتێک ماڵ و گەورەیی کاری لە عەمر نەکرد بۆ ئەوەی ساتێک لەجیهاد دوا بکەوێ .

عەمری کوڕی جەموح چوار کوڕی هەبوو هەر چواریان نیشانەی پیاوەتی وئازایەتیان پێوە دیار بوو ، ئەوە بوو جیهادیان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ کرد و کتابەکانی سیرە باسی ئەوانە دەکەن وەکو شێر ، ئەوانەش (خەلاد و مونذیر و موعاذ وموعەوەذ) بوون .

عەمری کوڕی جەموح بەشداری لە پەیمانی عەقەبەی دووەم کرد ، هەروەها (مەعاذ)ی کوڕیشی لەگەڵ بوو ، بەوە یەکێک بوون لە پێشەنگەکانی یاریدەرە بڕوادارەکان کەوا موبایەعەیان دا پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر بڕواداری وجیهادو خۆیە کوشت دان لەڕێگای خوا .... هەروەها عەمری کوڕی جەموح بەشداری غەزای بەدری کرد ، کە یەکەمین شەڕبوو لەنێوان کوفرو ئیمان ، هەرچەندە شەلییێکی زۆری پێوە دیار بوو ، هەروەها هەر سێ کوڕیشی : خەلادو مەعاذو موعەوەذ... بەشداری ئەم شەڕە بوون ... هەروەها کوڕەکانی هەوڵیان دا باوکیان بەشداری غەزای دووەم نەکات کە غەزای (ئوحد)ە ، پێیان گووت :- تۆ عوزرت هەیە ، هەروەک خوای گەورە دەفەرموێت :- (ليس على الاعمى حرج ، ولا على الاعرج حرج ، ولا على المريض حرج) .

هەروەها لەبەر ئەوەی گەورەیی جیهاد لەگەڵ خوێنی عەمر تێکەڵ ببوو ، دەیزانی گەورەترین پاداشتی هەیە لە ڕۆژی دوایی گەورەترین و بەرزترین پلەی بۆ شەهیدانە لە بەهەشت ، عەمر وای لێهات سوور بێت لەسەر داواکەی وخوێنی خۆی بڕێژێ لە گۆڕەپانی جیهادا ....

ئەوە بوو عەمری کوڕی جەموح شەکوای خۆی بردە لای پێغەمبەری خوا ﷺ تکای لێکرد بۆ جێبەجێ کردنی مەبەست و ئاواتەکانی ، بە پێغەمبەری ﷺ گووت :- ئەی پێغەمبەری خوا ، منداڵەکانم دەیانەوێ بێ بەشم بکەن لەم جیهادەو ، دەرچوونم لەگەڵ تۆ ، من لە خوا دەپاڕێمەوە کەوا بەم شکستی و شەلەییەم بچمە بەهەشت ...! (سبحان الله) لەبەر ئازایەتی و غیرەتی ئەم پیاوە !!

لەبەر ئەوەی عەمری کوڕی جەموح کەس داوای بەشداری شەڕی لێ نەکردبوو ، هەروەها ئیسلامیش عوزری بۆ هێنا بۆوە ، بەلام ئەم پیاوە کردەوەکانی بۆ خوای گەورە

بوو ، پاداشتی کردەوەکانی لە خودای گەورە داوا دەکرد ، بەڕاستی هەر میللەتێک خاوەنی ئەم غیرەت و دڵسۆزیە بێت بۆ سەرخستنی ئایینەکەیان ، خوای گەورە هەرگیز زەلیل و ژێردەستیان ناکا بەڵکو گەورەیی و دەسەڵات هەر بۆ ئەوان دەبێت . . .

پێغەمبەری خوا ﷺ سەری سوڕما لە ئازایەتی وغیرەتی ئەم پیاوە ، بۆیە پێی گووت: تۆ لای خوا عوزرت هەیەو ، جیهادت لەسەر نیە !!

لەگەڵ ئەوەش ڕووی لە ڕۆڵەکانی عەمر کرد و پێی فەرموون :-

(لەسەر ئێوە نیە باوکتان قەدەغە بکەن ، واتزیکە خوا پلەی شەهادەتی پێ ببەخشێت).

وادەگێڕنەوە عەمر بە پێغەمبەری ﷺ گوت :- ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، ئەگەر بینیت من شەڕم کردو لە ڕێی خوا کوژرام ، دەستی لە پێیە شەلەکەی خۆی داو گووتی:- ئایا بە پێی ڕاست ودروست لە بەهەشت دەسوڕێمەوە ؟!

پێغەمبەر ﷺ لەوە لامدا فەرمووی : دەڵێی ، وادەتبینم تۆ لە بەهەشت بەپێیەکی ڕاست ودروست دەڕۆیت . . . !!

عەمر بەم مزگێنیە زۆر کەیف خۆش بوو ، دەستیدا چەکەکەی و خۆی ئامادە کرد بۆ شەڕ ، لەگەڵ هەر چوار کوڕەکەی ، ئەم جەنگەش پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی سەرکردایەتی دەکرد . . . لەم کاتانەدا کەوا ڕێگای جیهادی گرتبوو ڕووی لە قیبلە کردو دەستی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان وگووتی :- اللهم ارزقني الشهادة في سبيلك ، ولا تردني الى اهلي خائبا) . واتە :- ئەی پەروەردگارا پلەی شەهادەتم پێ ببەخشە لەرێگای خۆت ، بە ناداڵی ودڵ ساردی مەمگێڕەوە بۆ ماڵەوە .

بەڵێ بڕوادار بەم جۆرە دەبێت ، بۆ ئەوەی شوێن پێی خۆی بکاتەوە لای خوا و نەک لای خەڵک ، گەورەیی دوا ڕۆژیش پێش دونیا بێخێت ، کوڕی جەموح داوا لە پەروەردگار دەکا بە زووترین کات خوای گەورە پلەی شەهادەتی بداتێ ، هەروەک بووک چاوەڕێی دەکات زەماوەندی بۆ بگێڕدرێت. کەوتنی لە مەیدانی جەنگ وشەهید بوونی بەشەرف وعززەت دادەنێ ، بەڵام گەڕانەوەی بۆ ماڵەوە بە سەلامەتی ، بە زەرەرو زیانێکی گەورە دەزانێ . . . . ئەوە بوو دەستاری شەڕ دەستی پێ کردو ، شەڕ توندبوو تۆز بەری ئاسمانی گرتبوو ، لەم ڕۆژە توندەدا عەمرو کوڕەکەی (خەلاد) بە ئازایەتی و خۆڕاگری مانەوە ، هەروەها لەم شەڕەدا لە یەکتر نزیک بوون ، تاکو هەردووکیان پلەی شەهادەتیان وەرگرت لە شەڕی ئوحدا .

کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی شەهید بوونی عەمری کوڕی جەموحی زانی فەرمووی :ـ بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە لە ئێوە هەیە ، ئەگەر سوێند لەسەر خوا بخوات ، خوا سوێندەکەی وەردەگرێت عەمری کوڕی جەموحیش یەکێکە لەوانە ، من بینم لە بەهەشت یەکەم هەنگاوی هاوێشت بە شەلاتیەکەی .

هەروەها هیچ پێچەوانەیی و ڕوویەروو بوونەوەیەک نی یە لە نێوان ئەم دوو ڕیوایەتە ، ئەوی تریان کە دەڵێت پی ی ڕاست ودروست دەبێ لەناو بەهەشت ، لەهەر دوو ڕیوایەت دا وادەگەیێنی ، یەکەم هەنگاو دەهاوێ بۆ بەهەشت بە پی ی شەلەوە ، پاشان خوای گەورە پی یە شەلەکەی چاک دەکاتەوە ، ئنجا بەڕاستی دروستی دەچێتە بەهەشتەوە .

خێزانی موجاهیدی شەهید عەمری کوڕی جەموح (هند کچی عمرو بن حرام) ، چووە ناو گۆڕەپانی جەنگ ، ... تەرمی پیاوەکەی (عەمر) و تەرمی کوڕەکەی (خەلاد) وبرایەکەی (عبدالله) بە شەهیدی هەڵگرت ..... سەرنج بدە هۆ خوشکانی بڕوادار لەبەر غیرەت و خۆڕاگری ئەم ئافرەتە موجاهیدە ، تەرمی مێردو کوڕی وبرای لەسەر ووشترێک باردەکاو خۆی ووشترەکە لی دەخوڕێ و بەرەو ماڵەوە دەیانباتەوە ، بەنیازی ئەوەی بە دەستی خۆی بیانێژێت بەبێ ئەوەی فرمێسک هەڵڕێژێت وقوڕبەسەری خۆی بکاو جوێن ونەفرەت بۆ لێپرسراوەکان ڕەوان بکات ، ئایا ئەمە چ ئیمانێکە وابزانم دابەشی بکەی بەسەر هەموو ئافرەتانی مسوڵمان لەوانەیە بەشیان بکات ، تەماشا کەن چ جۆرە خۆشەویستیەکان هەیە بۆ پێغەمبەرەکەیان ..!

تەماشاکەن هیندی بڕواداری (موجاهیدە) چۆن بە فەخرو شانازی یەوە تەرمی ئەم شەهیدانە دەگوازێتەوە ... هەر لەم کاتەدا لە ڕێگا تووشی دایکی مسوڵمانان عائیشە دەبێت (خوا لی ی ڕازی بێت) .. دایکی مسوڵمانان پرسیاری جەنگی لی دەکات ، ئەویش وەلامی دەداتەوە و دەڵێت : پێغەمبەری خوا ﷺ سەلامەتەو ، مادام ئەویش سەلامەت بێ هیچ گرفتێک نی یە ، وەخوای گەورەش لەناو ئەو بڕوادارانە شەهیدی هەڵبژاردووە .

حەزرەتی عائیشە (خ.ر) دەستی ڕەوانە کرد بۆ تەرمەکان ، پرسی ئەوانە کێن؟ هیند لەوەلامدا گوتی: یەکێکیان (عبدالله)ی برامەو ، ئەوەی تریان (خەلاد)ی کوڕمە ، ئەوی تریشیان (عەمر)ی مێردمە .... پاشان هیند حوشترەکەی لێخوڕی بەرەو (مەدینە) ڕۆیشت ، بەلام حوشترەکە غەزری و نەڕۆیشت ، هەرکە ڕووی لە

گۆڕەپانی جەنگ دەکرد بە خێرا دەڕۆیشت ، دووبارە ڕووی لە (مەدینە) دەکردەوە دیسان دەغەزری و نەدەڕۆیشت ، هێند ناچار بوو بگەڕێتەوە مەیدانی جەنگ لای پێغەمبەری خوا ، کەوا سەرپەرشتیاری جەنگ بوو ، ئەوە بوو مەسەلەی حوشترەکەی بۆ گێڕاوە ..... پێغەمبەر ﷺ فەرمووی :ـ ئەم حوشترە لە لایەن خواوە فەرمانی پێ کراوە .

خوای دەسەلاتدار بەتوانایە لەسەر هەموو زیندەوەرێک وگیان لەبەرێک ، فەرمانی دا بەسەر حووشترێکی بەستەزمان کەوا بغەزرێ و لە شوێنی خۆی بچەقێ ، چونکە ئەم شوێنە شیاوی ئەم شەهیدانەیە کە خوێنیان لیی ڕژاوە و گۆڕەپانی جەنگ شایەدی ئازایەتی و مەردایەتی ئەم شەهیدانە بدەن ، ئەم شوێنە پیرۆزە ببێت بە یادگارێک بۆ ئەوەی ئیسلامی داهاتوو بۆ ئەوەی پەندو عیبرەتی لی وەربگرن .

پێغەمبەری خوا فەرمانی دا هەموو شەهیدەکانی جەنگی ئوحد لە شوێنی شەهید بوونی خۆیان واتە لە گۆڕەپانی جەنگ بنێژرێن ، هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دا ئەو صەحابیانەی خۆشەویست وخزمی یەکترن ، پێکەوە بیانێژن ..

ئەوە بوو عەمری کوڕی جەموح وعبد الله کوڕی حەرام لەبەر ئەوەی یەکتریان خۆش دەویست وهاوڕێی یەکتر بوون ، پێکەوەیان ناشتن .

ئەوەی جێگای سەرسوڕمانە ئەوەیە (عەمری کوڕی جەموح) لەکاتی جاهیلی و پێش ئیسلام بوونی بتی دەپەرست (زۆر خزمەتی بتەکەی دەکرد) ، بتێکی لەدار دروست کردبوو لە ماڵەوە داینا بوو ناوی لی نابوو (مەنات) ، هەروەک ئەم کارە پیشەی هەموو گەورەکانی قورەیش بوو ، پاش ئەوەی (معاذ کوڕی عەمر) و (معاذ کوڕی جەبەل) موسڵمان بوون ، بەشەو خۆیان دەماسک داو ، بتەکەیان لە شوێنی خۆی لادەداو فڕێیان دەدا ناو زبڵدان و سەرەو نخونیان دەکرد .

کاتێ بەیانی عەمر دەچووە سەردانی بتەکەی ، پاش ئەوەی دەگەڕا لەبتەکەی هەتاکو دەیدۆزیەوە ، ئنجا بە توورەییەوە دەیگوت : سزا بۆ ئەو کەسەی ، وای بەسەر خواکەی من هێناوە !! پاشان عەمر بتەکەی هەڵدەگرتەوە دەیشوشت و بۆنی خۆش دەکردو دەیگووت :ـ والله ، ئەگەر دەزانم کێ وا بە تۆ دەکا ، ئابرووی دەبەم .

چەند جارێک ئەم کارانە دووبارە کرانەوە ، بەلام لەبەر ئەوەی ئەم صەحابیانە قوتابی پێغەمبەر بوون ﷺ دەیانویست بە شێوەیەکی وا قەناعەت بێنن بە عەمر هەروەک ابراهیم پێغەمبەر (علی نبینا وعلیه الصلاة والسلام) بە میللەتەکەی خۆی

کرد ... ئەمەش ئەوە بوو بەخۆی شمشێرەکەی بەدیارکەوت شمشێرەکەی لەملی بتەکە ناو ، بە بتەکەی گووت : بەو خوایە ئەوەی من دەیبنم ، نازانم کێ وا بە تۆ دەکات ، ئەگەر تۆزێک خێرت هەبێ ، مەهێڵە وات لێ بێ ، ئەوەش شمشێرە لەگەڵت .

هەرکە شەوهات ، دووبارە گەنجەکان دزەیان کردو ، شمێرەکەیان لەملی بتەکە کردەوە لەملی سەگێکی تۆپیویان کرد ، لە شوێنی بتەکەیان دانا ، دووبارە بتەکەیان فڕێ‌داوە ناو زبڵدان .

کاتی بەیانی عەمر هاتەوە لای بتەکەی و هەستی جوڵاو زانی لەناو گومڕایی و تاریکی دایە ، ڕووی لەخواکردو موسڵمان بوو ....

لەسەر ئەم کارەش بەڵێنی دا پاش ئەوەی خوای گەورە دڵی ڕۆناک کردەوە. بەڕۆناکی ئیسلام هەر جارێک پێغەمبەری خوا ژن بهێنێ ، ئەوا دەعوتی زەماوەندی دەهاوێشتە سەر ئەستۆی خۆی .

هەزارها سڵاو لە گیانی پاکی شەهید عەمری کوری جەموح و شەهیدانی جەنگی ئوحد...

## ١٨

# عاصمی کوڕی ثابت

## شەهیدێك مێش هەنگوین و زەردەواڵە لاشەکەیان پاراست

﴿١٨﴾

# عاصمی کوڕی ثابت

## (شەهیدێك مێش هەنگوین و زەردەواڵە لاشەکەیان پاراست)

ڕیسوایی و سەرشۆڕی بەهیچ جۆرێک کۆنابێتە لەگەڵ ئیمانی مسوڵمان ، خوای گەورە هەر لە زووەوە ئەم ڕاستیەی بۆ ڕوون کردوینەوە ، هەروەک لە قورئانی پیرۆز دەفەرمووێت : [ولا تهنوا ولا تحزنوا وانتم الاعلون ان كنتم مؤمنين] ...

ئەوانەی پێش ئێمە کەوا مامۆستایان پێغەمبەری خوا ﷺ پەروەردەی کردوون ، فێری کردوون کەوا بڕواداری موجاهید هەموو کات بەخێرهاتنی مردن دەکات ، بەڵام بەهیچ جۆرێک ڕیسوایی و سەرشۆڕی قەبول ناکات ....

ئیتر بەم جۆرە مسوڵمانی خاوەن ئیمان و غیرەت بەخێرهاتنی هەموو ناخۆشی یەک دەکات ئەگەر بە تۆپ و تەیارەو گوللەش لێیبدەن ، بەڵام بەهیچ شێوەیەک سەر شۆڕ ناکات ، بۆ دوژمنانی خوا ، بە ئارەزووی خۆیان فەرمان لەسەر خەلکان بدەن و بیانچەوسێننەوە .

ئەم یاوەرە بەرێزە یەکێکە لەوانەی وانەیەکی پەروەردەو جیهادیان دەداتێ ، ئەمەش ئەصحابەی موجاهیدی شەهید : [ابو سليمان عاصم کوڕی ثابت کوڕی ابى الأفلح ئەنصاری]یە ، یەکێکە لەوانەی پێشبڕکێی دەکرد لە بە دەنگ هاتنی ئایینی خوای گەورە ، پێغەمبەری خوا پاش کۆچکردنی بۆ شاری مەدینە ، عاصمی کرد بەبرا لەگەڵ قارەمانی شەهید (عبدالله ی کوڕی جحش ی ئەسەدی) ئەویش یەکێک بوو لەوانەی شەیدای وەدەستهێنانی پلەی شەهادەت بوو ، داوای لە خوای گەورە دەکرد دوژمنان لەشی پارچە پارچە بکەن ، بۆ ئەوەی بیبێتە بەڵگەی شەهادەت لە لای خوای گەورە ، بەم جۆرە خوای گەورەش دوعاکەی قەبول کرد .

عاصم بەشداری جەنگی بەدری کردو ، گەورەترین پلەی شەرەف و سەرفرازی تیا وەرگرت ، پاشان بەشداری جەنگی ئوحدیشی کرد ، لەم شەڕەدا توانی چەند کەسێک لە گەورە ستەمکارە گاورەکان بکوژێ ، لەوانە دوو برای ئافرەتێک بوون بە ناوی [سلافەی کچی سعد] لەبەر ئەوە ئەم ئافرەتە سوێندی خواردبوو و ئەزری کرد بوو ، ئەگەر سەری عاصمی بەدەست بکەوێت، پاش کوشتنی ، لە کەللەی سەری مەی (عەرەق) بخواتەوە ، لە تۆڵەی ئەو دوو برایەی بەدەستی ئەو کوژرابوون ، بۆ ئەوەی دڵی

ئارام ببێتەوە ، ئەمەش یەکێک بوو لە ڕەفتارە ئاشیرینەکانی کۆمەڵی نەزانی ، ئەوەی لەدەستیان بهاتبایە دەیانکرد ....

پاش کۆچکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ بە سێ ساڵ هەندێک دەڵێن لە مانگی سەفەری ساڵی چواری کۆچی. پێغەمبەری خوا کۆمەڵێک موجاهیدی بە مەبەستی پشکنین (استطلاع) کە پێک هاتبوون لە بیست موجاهید و ئەمیرەکەیان (عاصمی کوڕی ثابت) دەبێت ، دەیانێرێتە سەر گاورەکانی مەککە ...

بەم جۆرە عاصم موجاهیدەکان لەگەڵ خۆی دەبات ، بۆ ئەم ئەرکەی پێی سپێردراوە بەشەو لە چالاکیدا دەبن و ، بە ڕۆژیش خۆیان حەشار دەدەن ... پاش ئەوەی دوژمنەکانیان شوێنپێیان هەڵدەگرن بەهۆی ئەو ناوکە خورمایانەی لە پاشە خۆیان فرێی دەدەن ، ئیتر ئاشکرا دەبن ، گاورەکان نزیکەی سەد کەسیان بۆ ڕەوانە دەکەن ، عاصم بە خێرایی پەنا دەباتە بەر بەرزاییەک کە پێی دەڵێن (فەدفەد) لە نزیک ئاوی (هذیل) ، پێی دەڵێن (الرجیع) لە نێوان عوسفان و مەککە ...

گاورەکان لەگەڵ زۆری ژمارەیان چوار دەوری مسوڵمانانەکانیان گرت ، گاورەکان وەکو پیشەی بەردەوامیان بە فرت وفێڵ داوا لە عاصم وکۆمەڵەکەی دەکەن ، بە بەڵێن و پەیمان ، لە سەر بەرزاییەکە بێنە خوارەوە و شەڕیان لەگەڵ نەکەن ...

ئەم پەیمان شکێنانە وایان نیشان دا کەوا گفتوگۆ و ڕێککەوتن مەبەستیانە لەگەڵ مسوڵمانان ، بەڵام عاصم ئەم پیلان و نەخشەیەی ڕەت کردەوەو فەرمووی :. [بەڵام من نایەمە خوارەوە لەم بەرزاییە بۆ گاوران ، سوێند بە خوا پەیمانی گاور قەبوڵ ناکەم و ، بەهیچ جۆرێک پشتی پێ نابەستم ...] ...

ئەوە بوو شەڕی لەگەڵ کردن بە ئازایەتیەکی بێ وێنە ، ئەم ووشانەی دەگوتەوە :.

| | |
|---|---|
| ماعلي وانا جلد نابل | والقوس فيها وتر عنابل ؟ |
| ان لم اقاتلكم فامي هابل | الموت حق ، والحياة باطل |
| وكل ما شاء الاله نازل | بالمرء ، والمرء اليه ابل |

بەم جۆرە عاصم دەستی کرد بە تیرهاوێشتن ، تاکو تیرەکانی تەواو بوو ، ئنجا بە ڕمەکەی شەڕی کرد تاکو ڕمەکەی شکا ، ئنجا پەنای بردە بەر شمشێرەکەی .. ئیتر عاصم هەستی کرد بە ڕۆناکی خودا ، کەوا دڵ و دەروونی ڕۆناک کرد بۆوەو ، شەهادەتی نزیک ببۆوەو ، شەڕێکی بێ وێنەی کرد .... هەروەها پەیمانیشی دابوو لەشی بە لەشی

گاوران نەکەوێت ، ئەوانیش دەستیان بە ئەو نەکەوێت هەتا لەژیاندا مابێت ، پاشان ڕووی کردە خوای گەورە و فەرمووی :-
[ پەروەردگارا ، من پارێزگاریم لە ناپینەکەی تۆکرد لە کاتی نیوەڕۆ ، تۆش لە ڕۆژی دوایی بم پارێزە] .. ئیتر بەردەوام بوو لە جیهاد و تێکۆشان تاکو شەهیدبوو .
دوژمنەکانی ویستیان پاش شەهید بوونی دەسکاری لاشەکەی بکەن ، سەری لە لاشەی بکەنەوە ، بە دیاری بیبەن بۆ ئافرەتێک بە ناوی (سلافە) تاکو لی ی بکرێت ، بەڵام کاتێک بیریان لەم نەخشە دەکردەوە ، هەر ئەوەندەیان بینی چەند شانەیەک لە مێش هەنگوین و زەردەواڵە لەشیان داپۆشی ، لە دەورەی پەردەیەکی ئەستووریان دروست کرد ، هەروەک کتابی سیرە بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵێت :- [ خوای گەورە پۆلێک لە شانەی مێش هەنگوین و زەردەواڵەی ناردە پارێزگاری لاشەی عاصم ، ئەوەبوو هەروەکو پارچە هەورێک سێبەریان لی کرد ، بەم جۆرە هیچیان پی لەگەڵی نەکرا ، گووتیان :- چاوەڕێ دەکەین تاکو شەو دادێ ، بەڵکو مێش هەنگوین و زەردەواڵەکان دەڕۆن ، پاشان دێینەوە سەری ئەوەی بمانەوێ لەگەڵی دەکەین .. خوای گەورە ناوێکی بەهێزی بە ناو دۆڵەکەدا هێناو ، لاشەی عاصمی لەگەڵ خۆی برد ، بۆ ئەو شوێنەی خوا حەز بکات .....
پاشان تاوانبارەکان گەڕانەوە ، بەدوای لاشەکەدا گەڕان ، هەتا جێ شوێنی لاشەکەشیان نەدۆزیەوەو ، نەیان زانی بۆ کوێ چوو ؟!] .... ئەم نهێنیەش لەلای خوای گەورەیەو ، خوا چۆنی حەزبکات وادەبێ ، نهێنی واش هەیە خوا لە خەڵکی دەشارێتەوە ، تائەو کاتەی خۆی حەزی لی دەکات ....
بەم جۆرە (عاصم) وەفای خۆی گەیاند بە خوای گەورەو بەڵێنەکەی بەجێ گەیاندو ، کەمتەرخەمی لەم کارە نەکرد کە لە سەری واجب کرابوو ، بەڵکو بە ڕاستی جیهادی خوای کردو ، خوای گەورەش لە دەست دوژمنەکانی پاراستی .. پاش ئەوەی شەهیدیش کرا ....
کاتێک ئەم هەواڵە دەگا بە (عومەری کوڕی خەتاب) (خوا لی ی ڕازی بێت) لە گەڵ ئەم هەواڵە هەموو لەشی دەلەرزێ و لە قوڵایی دڵیەوە دەفەرمووێت :-
[ خوای گەورە بەندەی بڕواداری دەپارێزێت] ....
بەڵێ خوای گەورە ئەگەر یەکێکی خۆش بوێت و حەزی لی بێت دەیپارێزێت ، ئەگەر ئەم بەندەیەش لاشەیەکی بێ جوولە بێت ، کەوا ئەم لاشەیە ناتوانێت نەکەم و

نەزۆر بەرگری لەخۆی بکات ، خودای گەورە هەموو شتێکی بە دەستەو ، هەر فرمانێک بدات، ئەگەر نیازی بێت، بڵێت ببە دەبێت . .

عەبدوڵای کوڕی عباس (خوا لی ی ڕازی بێت) وا دەگێڕێتەوە ، پاش شەهید بوونی عاصم و هاوەڵەکانی ، هەندێک دووڕوو دەیانگووت :. [ قوڕبەسەری ئەم هەڵخەڵە تاوانە خۆیان بە کوشت دا بەم جۆرە ، نە لەناو ماڵی خۆیان مردن ، نە توانیان پەیامی پێغەمبەرەکەیان بگەیەنن] . . .

خوای گەورە دەرهەق ئەم موجاهیدە بڕوادارانەو نموونەی ئەوان ، ئەم ئایەتەی هێنا خوارەوە : [ومن الناس من يشري نفسه ابتغاء مرضاة الله ، والله رؤوف بالعباد]..

هەروەها پاشانیش دەربارەی ئەم دووڕووانەی کەوا قسەیان لەسەر ئەم شەهیدە بەرێزانە و نموونەی ئەم ستەمکارە فێڵبازانە ، چەند ئایەتێک هاتە خوارەوە :

[ومن الناس من يعجبك قوله في الحياة الدنيا ويشهد الله على ما في قلبه وهو الد الخصام ، واذا تولى سعى في الارض ليفسد فيها ويهلك الحرث والنسل والله لايحب الفساد ، واذا قيل له اتق الله اخذته العزة بالاثم فحسبه جهنم ولبئس المهاد].

پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی وابوو ڕێز بنێ لەم شەهیدانەو ، ورەی موجاهیدان بە هێز بکات و ، ترس وبیم بخاتە ناو دلی گاورەکان ، تاکو گومانی خراپ نەبەن بە هێزی بڕواداران ، لەگەڵ کۆمەڵێک لە هاوەڵەکانی پاش شەهید بوونی عاصم و هاوڕێکانی دەرچوون ، تا گەیشتنە ئەم شوێنەی کەوا ئەم شەهیدانە گیانی پاکیان بە خوای گەورە سپارد ، دوعای بەزەیی ولی خۆش بوون و ڕەزامەندی بۆ ئەم پۆلە هەڵۆ باڵ بە خوێنانە کرد .... تاکو چەند ڕۆژێک لەم ناوچەیە مانەوە ، پاشان گەڕانەوە بۆ گەیاندنی پەیامی خوا سەر لە نوێ .

سەلامی خوا لە شەهیدی پارێزراو عاصم کوڕی ثابت و هاوڕێکانی و هەموو ئەو شەهیدانەی بەدرێژایی ژیانی جیهادیان سەریان بۆ طاغوت وغیرعەونەکانی سەردەم شۆڕ نەکردو ، بۆ هیچ مەبەستێک تەنازولیان لە عەقیدەی خۆیان نەکرد .......

﴿١٩﴾

# حاریثەی کوڕی سوراقە

## شەهیدی خواناس

بیروباوەڕی کامڵ وا لە خاوەنەکەی دەکات شتی سەیروسەمەرە دروست بکات ، لەبەر ئەوەی بیروباوەڕی کامڵ هێزێکی لە بن نەهاتووی چەسپاوە ، دەبێتە هۆی بەدیهێنانی بیرو بۆچوون ، زانین لەزمانی ئاینی دا ڕۆناکی یەکە لە دڵ و دەروون هەڵدەقوڵێ و ، جێی خۆی دەکاتەوە لە بیروهۆشدا ئەوەش دەبێتە ڕێ نیشاندەری ئەم بڕوادارەو ، دەیگەیەنێت بە ڕاستی مەبەست . . .

[ ناسینی خوای گەورە مرۆڤ دەگەیەنێ بە ڕێگای پەروەردگار ، لە ڕێگای بیرکردنەوە لە دروست کراوەکانی ، پاشان بەردەوام دەبێت لە پابەند بوون بەم ڕێگایەوە ، لەبەر ئەوە (حارث المحاسبي) دەڵێت : (المعرفة تورث الانابة) ـ واتە : ناسین دەبێتە هۆی بەرقەرار بوونی مل کەچی و گەڕانەوە بۆلای خوا . . . .

مل کەچیش واتە گەڕانەوە بۆلای خواو ، پابەند بوون بە لق وپۆیەکانی و ، خۆبەستانەوە بەو شتانەی کە دەتگەیەنێت پێی ، هەروەک خوای مەزن دەفەرموێت: (فاقم وجهك للدين حنيفا ، فطرة الله التي فطر الناس عليها ، لا تبديل لخلق الله ذلك الدين القيم ، ولكن اكثر الناس لا يعلمون ، منيبين اليه واتقوه ، واقيموا الصلاة ، ولا تكونوا من المشركين) . . . . . .

وەئەگەر مرۆڤیش هیدایەت درا بۆ ڕۆناکی ناسین ، ئەوا نەفسی خۆی ڕادەگرێ لەسەر ئەو سنورانەی خوای گەورە بۆی داناوە ، کەس ناناسێ بێجگە لە ئەو ، وە ڕووناکاتە دوژمنەکانی خوا . . . . لێرەدا (البلخي الصوفي) دەڵێت :ـ [ هەر کەسێک خوای ناسی ، پێویستی بە کەسی تر نیە] وە (ابو زيد البطاحي) یش دەڵێت :ـ [ هەر کەسێک خوای ناسی ، واز لە هەموو شتێک دەهێنێت] .

هەروەها لە دەرچوانی قوتابخانەی گەورەی ئادەمیزاد (محمد) ﷺ مێرخاسی دووربین و هۆشمەندو زیرەک دروست بوون ، خوایان ناسی و ، ڕێگای ڕاستەقینەی خواپەرستیان لە هەموو ئاستێک گرتەبەر ، جیاوازیان نەکرد لەنێوان ئەو فرمێسکی دەڕژێت لە ترسی خواو ، ئەو دڵۆپە خوێنەی دەڕژێت لە پێناوی خوا ، پیاوی لە خواترسی کۆمەڵی و (صوفا) و پیاوی وەفاداری بەرخودان بوون . . . . . .

وەیەکێک لەمانە : ئەصحابەی تێکۆشەری جوانەمەرگی شەهید ، ناسراو بە خواناس ، حاریثە ی کوڕی سوراقەی ئەنصاری ، وە دایکیشی ئەصحابەیەکی بڕواداری ئەنصاری بوو کەوا ناوی : روبەیع کچی نوضر پلکی ئەنەسی کوڕی مالیک بوو . . . .

حاریثە گوێڕایەڵی دایکی بوو ، خۆشویستنەکی بێ ڕادە خۆشی دەویست و ، چاکەی زۆری لەگەڵ دایکی دەکرد ، هەتا دەگێڕنەوە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو : "چوومە بەهەشت ، حاریثم بینی ، ئەوەیە نموونەی چاکە لەگەڵ دایک" ، بەم جۆرە ئەم چاکە گەورەیەی دەدرێتەوە لە لایەن خوای گەورە ، ئەمەش شتێکی سەیر نیە دایک ئەوەندە بە منداڵ ماندوو دەبێت و نۆمانگان لەسکی خۆی هەڵیدەگرێت و دووساڵ شیری دەداتێ ، ئەوەیە بەهەشت لەژێر پێی دایکان ، هەروەک پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ دەیفەرموو . . . .

حاریثە گەنجێکی پاک و لەخواترس بوو ، خوای گەورە سینگی گۆش کرد بۆ ڕێگای خودا ، دڵ و دەروونی ڕۆناک بۆوە بە ئیسلام ، هیچ بیری نەدەکردەوە و قسەی نەدەکردو نەدەجوڵاوەو ڕێگایەکی نەدەگرت تەنها ئەگەر لە چوارچێوەی ئیمان وبڕوایی و ناسینی خوای گەورە نەبایە . . . . . .

ڕۆژێک پێغەمبەر ﷺ گەیشتە حاریثە و پێی گووت : ئێستاکە چۆنێت لەگەڵ ئیسلامەتیەکەت ئەی حاریثە ؟

حاریثە وەڵامی دایەوەو گووتی : بوویمە بڕوادارێکی کامڵ و تەواو . . . !!

پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو : تەماشا بکە چی دەڵێی ئەی حاریثە ؟ چونکە هەر قسەک بەڵگەو سەلماندنی هەیە . . . حاریثە پێی گووت: (ئەی پێغەمبەری خوا ، ئەفسم وازی لە دونیا هێناوە ، بەشەو شەونخونی دەکەم ، بەڕۆژ بە ڕۆژوو دەبم ، هەروەک بڵێیت عەرشی خوام لێ دیار بێت و ، هەروەک تەماشای خەڵکی بەهەشت بکەم هاموشۆی یەکتر بکەن و ، هەروەها هەروەک ببینم خەڵکی دۆزەخ هاوار بۆ یەکتر بکەن لە بەر ئازار ) . . . .

پێغەمبەری خوا ﷺ سەری سوڕما بە وەڵامەکەی ، پێی فەرموو : ئەی حاریثە ، خوات ناسیەو دەستی پێوەبگرە . . . . . پاشان پێغەمبەر ئەم قسانەی ئاڕاستەی حاریثە کرد: (عبد نوّر الله الایمان في قلبه) واتە (بەندەیەک خوا ڕۆناکی ئیمانی لەدڵ داگیرساندووە ) . . .

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ بە صەحابیەکانی فەرموو: (هەر کەسێک دەیەوێت تەماشای بەندەیەک بکات خوا گەورە ڕۆناکی ئیمان لە دڵی دابگیرسێنیت ، با تەماشای حاریثە بکات ....

حاریثە تەنها بە زۆری نوێژو ڕۆژووو زەکات و یادی خوا وازی نەهێنا ، بەڵکو ویستی ئەم خوا پەرستیانە بەجیهادو شەهیدی ڕێگای خوا برازێنێتەوە ، چووە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ، تکای لی کرد ، بەڵام چ تکایەک ؟! ئایا داوای پارەو پلەو پایەو ماڵی دونیای لی کرد ؟!!!

بەڵکو پیّی گوت: ئەی پێغەمبەری خوا ، تکام بۆ بکە بە شەهید بوون ...

پێغەمبەریش ﷺ ئەم تکایەی بۆ کرد ، لەخۆشیان حاریثە باڵی گرت ، چونکە گومانی نەما لەوەی خوای گەورە شەهیدی دەکا لەڕێگای خۆی ، لەبەر ئەوەی دوعای پێغەمبەر گەڕانەوەی بۆ نیە ....

حاریثە ڕۆیشت بۆ ئەوەی خۆی ئامادە بکات و ببێت بە یەکەم سوار چاکی ئەم مەیدانە ، یەکەم موجاهید بێت شەهادەت بە دەست بهێنێ ، کاتێک بانگی جیهاد دەکەن بۆ مەیدانی شەرەف و ڕاستی .... زۆری پیّ نەچوو جەنگی بەدر تیشکی داوە و حاریثە پێشبرکیّی بۆ کرد ، بە خوێن گەرمی و بەرخودان و بڕوایەکی پتەو بۆی ....

خوای گەورەیش ئەم بەڵێنەی پێغەمبەری بەجیّ گەیاندو ، مەبەست وهیوای حاریثە هاتە جیّ و ، بووە باشترین پیاوچاک و ، گەیشتە بارەگای خوای گەورە و لە گۆڕەپانی جەنگ شەهید بوو ، ئەو کاتەی لەبن دەستی پێغەمبەری خوا بوو ﷺ .....

وادەگێڕنەوە کاتێک حاریثە لە جەنگی بەدر بەشدار بوو ، بیووە بە دەوریە بەسەر لەشکر ، (حباب کوری عرقە) تیرێکی لی دا ، ئەو کاتەی ئاوی دەخواردەوە لەسەر حەوزێک ، ئەم تیرەش قوڕگی پیرۆزی گرتەوە .... حاریثە یەکەم کەس بوو لە کۆمەڵی ئەنصاریەکان پلەی شەهیدی وەرگرت ....

دەنگ وباسی شەهید بوونی حاریثە گەیشتە دایکی لەشاری مەدینە ، دایکی گووتی : واللە ، ناگرییێم هەتا ئەچمە لای پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لی نەکەم ، ئەگەر کوڕەکەم بەهەشتی بوو ئەوا بۆی ناگرییێم و ، بەڵکو ئارام دەگرم داوای پاداش لە خوا دەکەم ، وە ئەگەر دۆزەخیش بوو ئەوا بۆی دەگرییێم .....!!!

کاتیک پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕاوە ، دایکی حاریثە و خوشکەکەی حاریثە چوونە لای ، گووتی : (ئەی پێغەمبەری خوا ، تۆدەزانی شوێنی حاریثە لەناو دڵی من ،

ویستم لەسەری بگریێم ، پاشان گووتم: ئەوەی ناکەم تا پرسیار لە پێغەمبەری خوا نەکەم ، ئەگەر بەهەشتی بێت لەسەری ناگریێم ، وەئەگەر دۆزەخیش بێت بۆی دەگریێم)......

پێغەمبەر بەم جۆرە وەڵامی دایەوە: ئای لەتۆ ، عەقڵت بزرکردووە ، ئەک لە بەهەشتێک ؟ بەڵکو لە زۆر بەهەشتانە ، بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە ، حاریثە لە بەهەشتی فیردەوسی هەرە بەرزە ! ....

بەڵێ زۆر بەهەشت هەن ، بەهەشتی عەدن ، بەهەشتی مأوی ، داروسەلام ، دارو لخولد دارونەعیم ، فیردەوس ... حاریثە لە خۆشترینیانە ، ئەویش بەهەشتی فیردەوسی هەرە بەرزە ...

پاشان پێغەمبەر ﷺ داوای دەفرێکی کرد کەئاوی لە ناو بێت ، پاشان دەستی خۆی لەناو شوشت و ئاوەکەی لە دەمی خۆی وەرکردو کردیەوە ناو دەفرەکە ، پاشان دایە دەست دایکی حاریثە بۆ ئەوەی بیخواتەوەو ، ئەویش خواردیەوە ، پاشان دایە دەست کچەکەی خوشکی حاریثە ئەویش لی‌ی خواردەوە ...

پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکرد سینگو بەرۆکی خۆیان بێ بڕشینن بەم ئاوە ، ئەوانیش فەرمانەکەیان بەجێ‌هێنا ، .... ئیتر لەم کاتەوە هەموو خەمێکیان لە دڵدا ڕەویەوە ...گەڕانەوە لە لای پێغەمبەر ، لە مەدینەدا هیچ ئافرەتێک نەبوو وەکو ئەم دوو ئافرەتە چاوگەش و دڵ خۆش بن ، دایکی حاریثە وای لی‌هات لە کۆتایی دا ئەوەندە کەیف خۆش ببێت پێ بکەنێت ... بە کوڕە شیرینە خۆشەویستەکەی خۆی گووت : (بخ بخ لك یا حارثە) واتە: لێت پیرۆزبێت لێت پیرۆزبێت ، ئەی حاریثە لە ڕیوایەتێکی تردا دەگێڕنەوە دەڵێن گووتیەتی: ئەی پێغەمبەری خوا ، ئەگەر حاریثە لە بەهەشت بێت نە دەگریێم و نەخەم دەخۆم ، وەئەگەر دۆزەخیش بێت ئەوەندە دەگریێم نابێ بژیم لە خۆشی دونیا ...

ئەویش وەڵامی دایەوە فەرمووی: ئەی دایکی حاریثە ، حاریثە تەنها لەیەک بەهەشت نیە ، بەڵکو لە زۆر بەهەشتدایە ، حاریثە لە فیردەوسی هەرە بەرزە ...... پاشان بە پێکەنین گەڕاوەو گووتی: لێت پیرۆز بێت لێت پیرۆزبێت ئەی حاریثە .. لە ڕیوایەتی سێیەم دەڵێن بە پێغەمبەری گووت : ئەی پێغەمبەری خوا ، جێگای حاریثەم پێ بڵێ ، ئەگەر لەبەهەشت بێ ئارام دەگرم ، ئەگەر نا بەس خوا دەبینێ چی

دەکەم .. پێغەمبەریش پێی دەڵێ : ئەی دایکی حاریثە ، حاریثە لە بەهەشتێک نیە ، بەڵکو لە زۆر بەهەشتان دایە ، حاریثە لە فیردەوسی هەرە بەرزە ......

بەڵێ چارەنووسی ئەو کەسەی بەم جۆرە خوا بناسێ و لێی نزیک بێتەوە بەم جۆرە دەبێت ، وەجیهادکردنیش ترۆپکەکەی شەهید بوونە لە رێگای خوا ، وەفاداریش بۆ خوا بەرخودانە بۆی و ، هەوڵ تێکۆشان و واز هێنان لە ئارەزووەکانی دونیا ، هەر ئەو بۆی دەمێنێتەوە هەروەک دەفەرمووێت :۔[ما عندكم ينفد وما عند الله باق ، ولنجزين الذين صبروا اجرهم باحسن ما كانوا يعملون] .

سڵاوی خودا لە شەهیدی خواناس: حاریثە ی کوڕی سەراقەی ئەنصاری ...

سڵاو لە دایکی موجاهید روبەیع کچی نە ضر ....

# ناوەرۆك